ZANYAR

# هونەری وەڵامدانەوە

# وەڵامە جوان و دەمکوتکەرەکان

بەرگی یەکەم

ئامادەکردنی

ئاودێر ئەحمەد قەمتەرانی



ئامادەکردن و کردنە PDF

ڕۆژگار کەرکوکی

## پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێ هەژمار بۆ پەروەردگاری بێ هاوەڵ و خاوەن بەرزترین و بێ خەوشترین گوفتار، ئەو خودایەی کە مرۆڤی بە عەقڵ و لۆژیک ڕێزدار و پایەبەرزکرد و فەزڵیدا بەسەر تەواوی خەلق و گیاندار، فێری کرد بەرزترین بەها و جوانترین گوفتاری بەهێز و واتادار، تا لێک تێبگەن لە کاروبارو مامەڵەی ژیان و ڕۆژگار.

صەلات و سەلام لە پێغەمبەر و پەیامبەری سەردار، خاوەنی گوفتاری کورت و پوخت (جوامع الكلم) و بەرزترین ئاکار، بەهاتنی ئەو جیهان بوو ڕۆشن و پڕشنگدار، بڵاوی کردەوە پەیامی ئاشتی و نەیهێشت جەور و ستەمی زۆردار، جیاوازی چینی دەوڵەمەند و هەژار، بەرەکات و ڕەحمەتی یەزدانیش وەکو ڕێژنە بارانی بەهار، بڕژێ بەسەر سەرجەم هاوەڵانی خۆشەویست و ڕێزدار، نمونەی

شوێنکەوتەیی و خاوەن هەڵوێست و وەفادار، لە دوایشدا برژێ بەسەر تەواو باوەڕدار و موسڵمانانی خاوەن تەقوا و ئەمەکدار.

وەڵامە دەمکوتکەرەکان پێگەیەکی دیار و بەرچاویان لە هەردوو مەیدانی ئەدەب و ڕەوانبێژیدا هەیە، بەتایبەتیش لە ئەدەب و ڕاوانبێژی زمانی عەرەبیدا، بەجۆرێک کەم پەرتووک هەیە لەو دووبوارەدا کە هەڵگری چەندین وەڵامی لەو شێوەیە نەبێت. بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە لە ئەدەب ڕەوانبێژی زمانی کوردیدا بایەخێکی ئەوتۆ بەو هونەرە نەدراوە، ئەمە لە کاتێکدایە کە کلتوری کوردی پڕاوپڕە لەو جۆرە وەڵامانە، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا لە کتێبێکی سەربەخۆدا کۆنەکراونەتەوە، بەڵکو تاک تاکە لە کتێبەکانی سەرگوزەشتە و ژیاننامەکاندا ئاماژەیان پێکراوە. ئێمە لەو بەرگەدا هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی گشتی پێناسێکی کورتی ئەو جۆرە هونەرە بکەین و چەندین نموونەی جۆراو جۆری بخەینە ڕوو کە ڕەنگە زیاتر لە ئەدەب و ڕەوانبێژی زمانی عەرەبی وەرگیرابن، بەڵام هەوڵیشمانداوە کە چەند نموونەیەکیش کە لە کوردستانی خۆماندا ڕوویانداوە بیانخەینە ڕوو، ئەمە لەکاتێکدا چەند نموونەیەکیش لە ئەدەبە جیاجیاکانی جیهانیشی تێدایە، بەڵام بە پشتیوانی خودا لە بەرگی داهاتوو نموونەی زیاتر لە ئەدەب و ڕەوانبێژی کوردی دەخەینە ڕوو، داواکاریشم لە خوێنەری خۆشەویست کە هاوکارمان بن لە کۆکردنەوەی ئەو جۆرە وەڵامانە بەتایبەتیش ئەو وەڵامانەی کە لە ژیانی ڕۆژانەی خۆمان و باب و باپیراندا ڕوویانداوە و

گوێبیستیان دەبین یان دەیانخوێنینەوە و بەرچاومان دەکەون، تاوەکو لە داهاتوودا بتوانین بەرگێک تایبەت بکەین بەو هونەرە لە زمانی کوردی.

خوێنەری خۆشەویست دەتوانی لە ڕێگەی ئەم ژمارە موبایلەوە (٠٧٥٠٤٦٦٩٦٧٠) یاخود لە ڕێگەی ئەکاونتی تایبەتمەوە لە فەیس بووک (Awder Ahmed Qamtarani) بەرگی داهاتووی کتێبەکەمان دەوڵەمەندتر بکەن و خزمەتێک بە ئەدەب و ڕەوانبێژی و پەرتووکخانەی کوردی بکەن و کەشێکی خۆش و چالاکیش بە خۆمان و دەوروبەریشمان ببەخشین.

**چەند تێبینیەکی گرنگ:**

- دیارە مەبەست لە نووسینەوەی ئەو جۆرە وەڵامانە تەنها دەوڵەمەندکردنی پەرتووکخانەی کوردی و فراوانکردنی زیهنی خوێنەری کوردییە.

- بەهیچ شێوەیەک مەبەستمان لە گێڕانەوەیاندا زەمکردن و ناشیرینکردنی هیچ کەسایەتی و لایەنێک نیە.

- ڕەنگە بەشێک لە وەڵامەکان دروستکراوبن و تەنها بە مەبەستی خۆشی دانرابن.

- ڕووداوی وا هەیە بەناو چەند کەسێک گێردراوەتەوە، ئێمە ڕەچاوی ئەوەمان کردووە کە کامە کەسایەتی زیاتر لە سەرچاوەکان ناوی هاتووە بەناوی ئەومان کردووە.

- ناوهێنانی کەسایەتیەکان بە سادەیی لە هەندێک شوێن، هیچ مەبەستێکی لە پاشاوە نیە، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوەی ئەگەر لەگەڵ هەموو ناوەکاندا (خوا لێی ڕازی بێت) یان (ڕەحمەتی خودای لێبێت)...یان هەر دەستەواژەیەکی ترمان دانابا ڕەنگە لە کاتی خوێندنەوە لەبەهێزی وەڵامەکەی کەمبکردبایەوە.

**پێناسەی وەڵامە دەمکوتکەرەکان**

بریتیە لە وەڵامێکی ژیرانە و زیرەکانە، کە پرسیارلێکراو بەمەبەستی دەمکوتکردنی پرسیارکەر دەریدەبڕێت، چەندین ناوی تریشی هەیە، وەڵامی بێ دەنگکەر، وەڵامی ئامادە، وەڵامی ژیرانە.

هەروەها دەتوانین بڵێین: وەڵامی دەمکوتکەر هونەر و شێوازێکی بەرزی ڕەوانبێژییە وەک گوللە کەسەکان دەپێکێ و دەمکوتیان دەکات و چۆکیان پێدادەدات و سەریان پێدادەنوێنێ.

بەم پێناسەیەش دەردەکەوێت کە وەڵامی دەمکوتکەر پێویستە بە بێژەیەکی بەتوانا دەرببڕدرێت، کە زۆربەی کاتەکان مەبەست لە دەربڕینیان ڕاستکردنەوەی هەڵەیە لە قسەکردن و شێوازی قسەکردن، یاخود دەرخستنی حەقیقەت و ڕاستی، یانیش

ڕەواندنەوەی گومانێک لە زیهنی پرسیارکەر، زۆرجارانیش بۆ گاڵتە و گەپ بەکاردەهێنرێت.

گێڕانەوەی ئەو جۆرە لە وەڵام کارێکی ئاسان نیە، بەڵکو دەتوانین بڵێین یەکێک لە قورسترین گێڕانەوەکانە، هەربۆیەش پاراستنیان کارێکی ئاسان نیە، بەڵکو پێویستیان بە بیرێکی تیژ و خەیاڵێکی فراوان هەیە.

**تایبەتمەندی وەڵامە دەمکوتکەرەکان**

وەڵامی دەمکوتکەر یاخود بێدەنگکەر چەندین تایبەتمەندی و نیشانەی تایبەت بەخۆی هەیە کە لە وتەی ئاسایی جیایان دەکاتەوە، لە گرنگترینی تایبەتمەندیەکانیشی:

**١ -خێرایی لە وەڵامدانەوە:**

خێرایی لە وەڵامدانەوە یەکێکە لە تایبەتمەندییە هەر دیارەکانی ئەو جۆرە لە قسەکردن، دەکرێت بووترێت ئەو جۆرە وەڵامە لەدایک بووی ساتە وەختی پرسیارکردنە، چونکە هەر کاتێک بیرکردنەوە و ڕامان کەوتە نێو وەڵام ئەوا لە چوارچێوەی وەڵامی دەمکوتکەر دەچێتە دەرەوە، پێویستە پێشتر ئەو وەڵامە لە دەرووندا پێگەیەکی نەبووبێت، هەر لەبەر ئەو تایبەتمەندییەشە کە بە قورسترین

جۆرەکانی ئاخاوتن دادەنرێت، هەروەها لەبەر ئەوەی کە خاوەنی وەڵامەکەش بەبێ هیچ خۆ بۆئامادەکردنێک وەڵامی پرسیارکەر دەداتەوە بە کەسی لێهاتوو و زیرەک و ژیر دادەنرێت.

**٢ -پێکان و جێگەگرتن:**

ئەو وەڵامەی پرسیارلێکراو دەیداتەوە پێویستە جێگەی خۆی بگرێت و ئامانجەکەی بپێکێ، هەر ئەمەش جۆری وەڵامەکە دەکاتە وەڵامێکی دەمکوتکەر، بە ئەندازەی ئەوەش کە وەڵامەکە پێویستە لەجێ و شیاوبێت، هێندەش پێویستە کە شوێنی خۆی بگرێت و ئامانجی خۆی بپێکێ، بۆ ئەوەی وەڵامەکەش جێگەی خۆی بگرێت پێویستە کە ئەو دەستەواژانەی بەکاردەهێنرێن سەلامەت بن لە ڕووی ڕێزمانیەوە، ئەگەرنا پرسیارلێکراو دەخاتە پرسیارێکی ترەوە، کە ڕەنگە زۆرجارانیش ببێت بە خاڵێکی لاواز لەسەری، بەمەش وەڵامەکە لە چوارچێوەی وەڵامی دەمکوتکەر دەردەچێت و سەنگ و بەهایەکی ئەوتۆی نامێنێ.

**٣ -کورتبڕی لە دەربڕین:**

ئەم تایبەتمەندییەش هیچی وای لە تایبەتمەندییەکانی تر کەمتر نیە، چونکە هەمیشە وەڵامی خێرا، کە بتەوێ شوێن و پێگەی خۆی بگرێت و ئامانجی بپێکێ، پێویستە کورت بێت و بەدووربێت لە درێژبڕییەکەی بێزارکەر، تاوەکو وەڵامدەر بتوانێ لە کەمترین کاتدا

وەڵامی خۆی بگەیەنێت بە پرسیارکەر و بواری ئەوەی نەدات کە بیپچڕێنێت، هەر ئەوەشە کە گفتوگۆیەکە زۆر بەهێز دەکات .

٤ -جوان دەربڕین:

ئەمەش بە هەڵبژاردنی شێوازێکی جوان و گونجاوی ڕەوانبێژی دەبێت، هەروەها پێویستە هاوسەنگیەک لە نێوان وشەکاندا هەبێت، بە ئامانجی ئەوەی وەڵامەکە کاریگەرییەکی تەواو لەسەر بەرامبەر دورست بکات، ئەمەش هۆکارێکە بۆ ئەوەی پرسیارکەر بەئاسانی چۆک دابدات و قەناعەتی لا دروست بێت، یانیش ملکەچ بکات و بێدەنگ بێت.

٥ -بێ دەنگکردن و دەمکوتکردن:

ئەمە دەرئەنجامی هەر چوار تایبەتمەندییەکەی پێشووە، دوای ئەوەی بە شێوەیەکی خێرا و جوان و کورت و ئامانج پێک وەڵامی پرسیارکەر دەدرێتەوە پێویستە دوای ئەو تایبەتمەندیانە پرسیارکەر دەمکوت بکرێت و وتەیەکی بۆ وتن نەمێنێتەوە، جا وەڵامەکانیش بە گوێرەی کات و شوێن و شێوازی پرسیارکەر و چۆنیەتی پرسیارکردن و بابەتی پرسیارکردنەکەی دەگۆڕدرێت.

پێویستە ئەوەش بووترێت کە هەمیشە لە وەڵامی بێ دەمکوتکەردا کەسی پرسیارکەر کەسێکی ناشیرین و دزێو نیە، یاخود بەواتایەکی تر بڵێین کە هەمیشە دژایەتی لەنێوان پرسیارکەر و پرسیارلێکراو

نیە، هەمیشە پرسیارکەر بێ باوەڕ و پرسیارلێکراو باوەڕدارنیە، هەمیشە ئەوەی دەپرسێ ناحەق و وەڵامدەر لەسەر حەق نیە، هەمیشە ئەو خراپ و ئەویشیان باش نیە....بەڵکو زۆرجار هەردووکیان باوەڕداران و هەردووکیان لەسەر حەق و هەردووکیشیان کەسی باشن...زۆرجارانیش ڕەنگە تەواوی ئەوانە پێچەوانە بن.

**٦ -پێویستە وەڵامەکە لە ئاست تێگەیشتنی کەسی پرسیارکەر یاخود قسەکەر بێت:**

واتا وەڵامدەر دەبێت ڕەچاوی ئاستی تێگەیشتنی ئەو کەسە بکات کە قسە یان پرسیارێکی وروژاندووە، نابێت وەڵامەکەی زۆر بەهێز و وتەکانی قورس بن، ئەگەر هاتوو کەسی بەرامبەری کەسێکی ئاسایی بوو و لە هەموو وڵامێک تێنەدەگەیشت، بەپێچەوانەوەش نابێت وەڵامەکە هێندە ئاسایی بێت لە کاتێکدا کە کەسی بەرامبەر زانایەک یاخود کەسێکی خاوەن ئاست و تێگەیشتنێکی بەرز بێت، بە کورتیەکەی هەرکاتێک وشەکانی نێو وەڵامەکە لە ئاست کەسی بەرامبەر نەبوون، یان نامۆ و نەبیستراو و بەکارنەهێنراو بوون و بیستنیان لەسەر گوێ قورس و ئاسان نەبوو، ئەوا وەڵامەکە بێ سەنگ وبایەخ دەبێت و نابێتە وەڵامێکی دەمکوتکەر.

هەروەها پێویستە ئەوەش بووترێت کە هەمیشە وەڵامی دەمکوتکەر بۆ شکاندن و ڕووشاندنی کەسایەتی بەرامبەر نیە، بەڵکو ئامانجی

سەرەکی لەو جۆرە وەڵامانە گەیشتنە بە حەقیقەت و ڕاستی شتەکان و باوەڕ پێهێنانی کەسی بەرامبەر، بەمەش دەردەکەوێت کە وەڵامی بێدەنگکەر ئامانجێکی پەروەردەیی هەیە. هەندێک جاریش وەڵامێکی گاڵتەجارانە و جارجارەش ستایشکارانە و ڕەنگە هەندێک جاریش بۆ شکاندنی کەسایەتی بەرامبەر بێت!

بەمەش دەتوانین وەڵامە دەمکوتکەرەکان بکەین بە چەند جۆرێکەوە، ئەوانیش:

**١ -وەڵامێک کە وەڵامی کەسانی گەوج و بێ ڕێزی پێ دەدرێتەوە، لەو حاڵەتەدا پیویست دەکات کە وەڵامەکە توند بێت.**

**٢ -وەڵامێک کە لەلایەن زانایانەوە دەدرێتەوە، بەرامبەر قسەیەکی هەڵبەستراو کە بەرامبەریان ئەنجامدراوە .**

**٣ -وەڵامی دانایان، هاوار بۆ ئەو کەسەی کە توڕەیان دەکات!**

**٤ -وەڵام بۆ کەسە ڕەزا قورسەکان.**

**٥ -وەڵام بۆ کەسانی لەخۆبایی و خۆبەگەورەزان و نەزان.**

**٦ -وەڵامی زانایان بۆ زانایان.**

## چۆن وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە کە ئارەزوویان ناکەین و ڕووشکێنمان دەکەن؟

چەند ڕێگایەک هەیە بۆ ئەوە کە وەڵامەکانمان جێگەی خۆیان بگرن و ئەو پرسیارانەی بە مەبەستی شەرمەزارکردن و شکاندنەوەمان ئاڕاستەمان دەکرێنەوە کۆتایی و ئاڕاستەکەیان لەبەرژەوەندی خۆمان بگۆڕین، لە گرنگترین ئەو ڕێگایانەش:

١ -ئەگەر پرسیارێکی لەو شێوەیەت لێکرا پێویستە زوو وەڵام نەدەیتەوە و لە بیری خۆتدا تا دە بژمێری، تاوەکو لە وەڵامەکەی پەشیمان نەبیتەوە، بەتایبەتیش ئەگەر پرسیارەکە تورەی کردی و بووە هۆی هەڵچونت.

٢ -ئەگەر زانیت پرسیارەکە شکانەوەیەک یان شەرمەزاریەکی بۆ تۆ تێدایە، وا خۆت نیشان بدە کە لە پرسیارەکە نەگەیشتووی و داوای دووبارە کردنەوەی پرسیارەکە لە پرسیارکەر بکە، بەڵام ئەگەر زانیت دووبارە کردنەوەکەی دەبێتە زیاتر ئاگادار کردنەوەی دەوروبەر و شکانەوەی زیاترت بۆ دروست دەکات، ئەوا باشترە ڕێگەیەکی تر هەڵبژێری بۆ خۆ دەربازکردن.

٣ -ئەگەر زانیت شوێنەکە گونجاو نیە بۆ ئەو پرسیارەی کە ئاڕاستەت کراوە، زۆر ئاساییە ئەگەر بە پرسیارکەر بڵێت: ئێرە شیاو نیە بۆ ئەو جۆرە پرسیارە.

٤ -هەروەها ئەگەر زانیت کات و شوێنەکە شیاو نیە دەتوانی بە پرسیارکەر بڵێت: ئێرە شیاو نیە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکەت، یان کاتەکە وا دەخوازێت کە ئێستا وەڵامی ئەو پرسیارەت نادەمەوە، دەشتوانی بڵێی: لە کاتێکی تردا وەڵامی ئەو پرسیارەت دەدەمەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەدا پێویستە باری ئاسایی خۆت بپارێزی و شڵەژانت پێوە دیار نەبێت.

٥ -هەموو کاتێک وەڵامەکانت تەنها بە وشەی نەخێر مەدەرەوە، چونکە ڕەنگە هەندێک جار درێژە دان بە وەڵام لەبەرژەوەندی تۆ بێت، بۆنموونە: پرسیارت لێدەکەن: ئایا هەست ناکەیت ئەو بڕە پارەیەت بە هەڵە بەکارهێناوە، تۆ یەکسەر مەڵێ نەخێر، بەڵکو دەتوانی بڵێی: ئەو پارانەی کە خەرج کراون لە شتی بەسوود و پێویستدا خەرج کراون، بۆنموونە..دوو سێ نموونە بخەیە ڕوو.

٦ -هەندێک جار وەڵامەکە دوابخە و بڵێ، ئێستا وەڵامی ئەوەشت دەدەمەوە، ڕەنگە ئەمە بوارێکی باشت پێ بدات بۆ بیرکردنەوە و دۆزینەوەی وەڵامێکی ژیرانە.

٧ -گومان و گرێ بخه پرسیاره... یان دهتوانی بهڵگهیهک لهسهر ڕوونتر پرسیارهکهت بکه، پرسیارهکهتم بدهیه، ئهمهش تهکتیکیکی باشه بۆ دواخستنی وهڵامهکه و لاوازکردنی هێزی پرسارهکه...یان دهتوانی له پرسیارکهر بپرسێت: چی وای لێکردیت که ئهو پرسیاره بکهیت.

٨ -یهکێک له ڕێگا به هێزهکانی وهڵامدانهوهی ئهو جۆره پرسیارانهش پێچهوانه کردنهوهی پرسیاره، بۆنموونه پرسیارکهر دهپرسێت: ئایا پێتوانیه که ئهو شته وایه، تۆ بڵێی: ئایا تۆ پێت وانیه که وانیه!

٩ -ههندێک جاریش دهتوانی بڵێی: ئهگهر بیرت لای ئێمه بووبێت پێشتر وهڵامی ئهوهمان دایهوه.

١٠ -ئهگهر زانیت پرسیارهکه سنووری ڕێز و شهرمی شکاند، دهتوانی هیچ وهڵامێک نهدهیتهوه، یان دهتوانی بڵێی: من دانابهزمه ئهو ئاسته نزمه، وهڵامی بێ شهرمی به بێدهنگی دهدهمهوه!

١١ -ههندێک جار وا خۆت نیشان بده که زۆر ئارهزووی ئهو پرسیارهت کردووه، بڵێ: پرسیارێکی زۆر جوانه!! بهڕاستی پرسیارێکی له جێت کرد!! یان باشبوو ئهو پرسیارهت کرد...

١٢ -ههندێک جاریش بۆ ئهوهی خۆت له تهڵهی شکاندنهوه و شهرمهزارکردن بدزیتهوه دهتوانی بڵێ: بهڕاستی ئهوه پرسیارێکی

بێ مانایە، ئەو جۆرە پرسیارە لە کەسانی وەک ئێوە ناوەشێتەوە، پرسیارکردنیش شێوازی خۆی هەیە، سەرەتا خۆت فێری چۆنیەتی پرسیارکردن بکە ئینجا پرسیار بکە!!

١٣ -هەروەها هەر کاتێک پرسیاریان سەبارەت بە کەسێک کرد، دەتوانی بڵێی: من ناتوانم لە جیاتی ئەو وەڵامت بدەمەوە، ئەو ژیانی تایبەتی خۆیەتی چی دەکات یان نا!!، هەروەها ئەگەر کەسەکە مابوو بڵێ: خۆی زیندووە دەتوانی پرسیار لەخۆی بکەیت، ئەگەر مردبوو دەتوانێ بڵێی: ئەو تازە مرد بۆیە نامەوێ هیچ شتێکی دەربارە بڵێم.

## • پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) و نەمرود

جارێک نەمرود لەگەڵ پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) سەبارەت بە بوون و دەسەڵات و توانای خودا دەبێتە مشتومڕیان، ئەمە لە حاڵێکدا کە خودا ئەو پادشاییەتیەی بە نەمرود داوە، کە دەیوت من خودام (پەنا بەخودا)، بە پێغەمبەر ئیبراهیمیشی وت: ئەی خودای تۆ کێیە؟

- ئیبراهیم (علیه السلام) فەرمووی: ﴿ ...رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ ... ﴾ واتە: ((خودای من ئەو زاتەیە کە ژیان و مردنی بەدەستە، دەژێنێ و دەمرێنێ)).

- ئینجا نەمرود وتی: ﴿ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُ ﴾ واتە: ((منیش ئەوەی بمەوێت زیندووی دەکەمەوەو، ئەوەیش بمەوێت دەیمرێنم))، وەکو ئەوەی کە کەسێک کەسێکی تر بکوژێت، من نایکوژمەوەو لێی دەبورم، بەڵام بۆ یەکێکی تر تۆڵەی لێ وەردەگرمەوەو لێی خۆش نابم و دەیکوژم.

- پاشان ئیبراهیم بۆ دەم کوتکردنی فەرمووی: ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ ﴾ واتە: ((باشە خودا ڕۆژ لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێنێت، ئەگەر تۆیش خودایت، لە ڕۆژئاواوە هەڵیبێنە)).

- ﴿ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَۗ ﴾ ئەوسا ئیتر نەمرودی بێباوەر واقی وڕماو حەپەسا و نوقەی لێبڕا و وەڵامی نەما و مت بوو.

- کەواتە سورەتێک هاوشێوەی ئەو بێنن

بێباوەڕان سەرەڕای هێنانی دەیاها بەڵگە و نیشاندانی چەندان موعجیزە هەر دەیانووت:

- بە ڕاستی ئەوەی محمد دەیڵێ هەموو هەڵبەستراوی خۆیەتی و لە لایەن خوداوە نیە.

پەروەردگاریش بە پێغەمبەری فەرموو تۆش پێیان بڵێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ [یونس: ٣٨] واتە: ((بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمد (ﷺ) قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دەئێوەش سوورەتێک وەک سوورەتەکانی دارێژن و بیهێنن، داوا بکەن لەهەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لەخوا (کەیارمەتیتان بدات) درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن)).

- ئایا خودا لە توانایدا هەیە ئێسکەکان کۆبکاتەوە؟!

پەروەردگاری مەزن دەفەرمووێت:

- ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴾ واتە: ((ئایا مرۆڤ وادەزانێت هەرگیز ئێسکەکانی کۆناکەینەوە؟!)).

ئایەتی دواتر وەڵامی ئەو ئایەتەیە و ئەو جۆرە کەسانە دەمکوت دەکات کەوا بەم شێوەیە بیردەکەنەوە و دەفەرمووێت: ﴿ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن

﴿ نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ﴾ واتە: ((بەڵێ، لەوە زیاتریش دەکەین و توانامان هەیە کە نەخشە وردەکانی سەر پەنجەکانی بەدی بهێنینەوە)).

### •پێغەمبەر عیسا (علیه السلام) و شەیتان

گێڕدراوەتەوە، کە جارێکیان ئیبلیس (شەیتان) لە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خودای لێبێت) دەردەکەوێت و لێی دەپرسێ:
- ئایا تۆ ناڵێی کە ئەگەر خودا دووچاری بەڵا و ئازارت نەکات کەس ناتوانێت دووچارت بکات؟
- ئەویش فەرمووی: با بەدڵنیاییەوە.
- ئیبلیس وتی: دەکەواتە بڕۆ خۆت لەسەر لوتکەی ئەو شاخە بخە خوارەوە بزانە سەلامەتی بۆت نووسیوە یاخود ئازار.
پێغەمبەر عیسا (سەلامی خودای لێبێت) فەرمووی: ئەی نەفرین لێکراو، خودای گەورە بەندەکانی تاقیدەکاتەوە، بەندەکان بۆیان نیە کە پەروەردگاریان تاقی بکەنەوە.

### • هەمووی ماوەتەوە تەنها شانەکەی نەبێت

دایکی باوەڕداران عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت) مەڕێکی کردە خێر و لە گۆشتەکەش تەنها شانی مەڕەکەی بۆ خواردنی خۆیان هێشتەوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە عائیشەی پرسی: - چیت هێشتۆتەوە لەو مەڕە؟
ئەویش (خودا لێی ڕازی بێت) وتی: تەنها شانەکەی ماوەتەوە.

پێغەمبەری خوداش فەرمووی:
- هەمووی ماوەتەوە تەنها شانەکەی نەبێت!!

## • نەفس ماندووتر دەبێت یاخود جەستە؟

لە سۆقڕاتیان پرسی:
- ئایا نەفس ماندووتر دەبێت یاخود جەستە؟
- وتی: نەفس، چونکە جەستە کاتێک ماندوو دەبێت کە نەفسی تێدابێت.

## • کامیان ڕزقەکەی لەسەر خودا نیە لە ماڵەکەت بیخە دەرەوە

لە عەلی کوڕی بەککارەوە دەڵێت:
- کەسێک هاتە لای ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم و سکاڵای ژمارەی زۆری خێزانەکەی دەکرد.
- ئەویش پێی وت: بڕۆ ماڵەوە سەیربکە بزانە کامیان ڕزقەکەی لەسەر خودا نیە لە ماڵەکەت بیکە دەرەوە.

## • وەڵامێکی دەمکوتکەری مەولەوی

مەولەوی لەشاری سنە لە مزگەوتی (دار الإحسان) لەگەڵ چەند کەسێکی هاوتەمەنی خۆی فەقێ دەبێ، یەکێک لەو فەقێیانە شیعە دەبێت.

بەهار دێ...هەموو فەقێکان ڕێکدەکەون کە بەیەکەوە گەشتێکی بە کۆمەڵ بکەن...قەدەری خودا وا ڕێک دەکەوێت کە دەچنە ژێر دارێک کە کانیەکی سازگاری لەنزیک بوو، گۆڕستانی گوندیش هەر لەنزیک ئەوانەوە بوو.
دەست دەکەن بە خواردن ئامادەکردن و چا لێنان...بەدەم ئامادەکردنی خواردنیشەوە مەولەوی جار جارە توانجێک لە فەقێ شیعەکە دەدا.
بەڵام فەقێ شیعەکە لەبەرامبەر وتەکانی مەولەوی هیچ وەڵامێکی نابێ، بۆیە ناچار خۆی بێ دەنگ دەکات.
لەناکاو چاویان دەکەوێتە سەر سەگێک...سەگەکەش دەچێت لەتەک گۆڕێک میزێک بە کێلی یەکێک لە گۆڕەکان دا دەکات.
فەقێ شیعەکە ئەو دیمەنە بە هەل دەزانێت بۆ ئەوەی وەڵامێکی مەولەوی بداتەوە، بۆیە ڕوو دەکاتە مەولەوی و دەڵێت:
- مەولەوی بینیت ئەو سەگە میزی بە گۆڕی سونییەک داکرد؟
مەولەویش بێ ئەوەی هیچ خۆی تێک بدات زۆر لەسەرخۆ وتی:
- چنیە، ئەو دوژمنایەتیە لە نێوان شیعە و سوننەدا هەر لەکۆنەوە هەیە!
شیعەکە دەمکوت بوو، لەو ڕۆژەوە زۆر لەگەڵ مەولەویدا وێرانەدەچوو.

• دوو دەشتەکی

- ئەعرابیەک بە ئەعرابیەکی تری وت: بیست درهەمم بدەیە بە قەرز، مانگێکیش دەرفەتم بدەیە بۆ دانەوەی.
- ئەویش وتی: بۆ درهەمەکان داوای لێبوردن دەکەم، بەڵام لە جیاتی مانگەکە دەتوانم ساڵێک دەرفەتت پێ بدەم.

• به چوار پێ دەت بینم!

مەلا عەبدوڵای مەریوانی، نوسەر و وێژەوانی بەناوبانگ، کەمێک چاوەکانی مەیلی خێلیان دەکرد، خۆی لە تەوێڵەی سەر بە پارێزگای سلێمانی دادەنیشت.

جارێکیان بۆ دیدەنی مەحمود پاشای جاف دەچێت بۆ هەڵەبجە، مەحمود پاشاش لە میانەی قسەکانیدا بە پێکەنینێکەوە دەڵێت:

- ئەرێ بەڕاست مامۆستا عەبدوڵا ڕاستە دەڵێن تۆ یەک بە دوو دەبینی؟

مەلا عەبدوڵاش خێرا دەڵێت:

بەڵێ بەڵێ، ئەوە ڕاستە من ئێستا دوو پێی تۆ بە چوار دەبینم!

• دز و هەژارێک

کۆمەڵە دزێک دەچنە ماڵی هەژارێک، وتیان:

- بێنە چیت هەیە پێمان بدە.

- هەژارەکەش دەڵێ: ئەوەی ئێوە بەشەو بۆی دەگەڕێن من بە ڕۆژ دەستم نەکەوت.

## • دووڕوو کێیە؟

مامۆستایەک لە قوتابیەکانی پرسی:
- کێ پێم دەڵێ دووڕوو کێیە؟
- قوتابیەک: مامۆستا دووڕوو ئەو قوتابییە کە بە پێکەنینەوە پێ دەخاتە قوتابخانە.

## • ئایا دەزانی بە جوانی لە خودا بپاڕێیەوە

لە دەشتەکییەکیان پرسی:
- ئایا دەزانی بە جوانی لە خودا بپاڕێیەوە؟
- وتی: بەڵێ.
- وتیان دەی بپاڕێوە.
- ئەویش وتی: خودایە گیان ئێمەت بە موسڵمان دروست کرد بێ ئەوەی داوات لێ بکەین، لە بەهەشتیشت بێ بەشمان مەکە کە داوات لێدەکەین.

## • کەس ستەم لە پیاوی کورتە باڵا ناکات

ڕۆژێکیان کیسرا بۆ چارەسەکردنی کێشەی ئەو کەسانەی کە ستەمیان لێکرابوو دانیشتبوو ، لەناکاو پیاوێکی کورتە باڵا هاتە ژوورەوە.

- وتی: گەورەم من ستەمم لێکراوە.

- کسیراش هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، تەنانەت ئاوڕیشی لێنەدایەوە، تا وەزیرەکە لە کیسرای دووبارە کردەوە.

- وتی ئەو پیاوە کورتە باڵایە ستەمی لێکراوە.

- کیسراش وتی: کەس ستەم لە پیاوی کورتە باڵا ناکات.

- پیاوەکەش وتی: ئاخر ئەوەی ستەمی لەمن کردووە لە من کورتترە.

## • پێت خۆشە لەسەر حەق بمکوژن؟

ئەو کاتەی سۆقڕاتیان برد بۆ ئەوەی بیکوژن، ژنەکەی دەگریا.

- سوقڕاتیش وتی: بۆ دەگریەی؟

- ژنەکەی وتی: چونکە بە ستەم دەتکوژن.

- سۆقرات وتی: بۆ پێت خۆشە ئەوان لەسەر حەق بن ئینجا بمکوژن؟؟!

### • هەرکەسەو بە دوای ئەوشتەدا دەگەڕێت کە نیەتی

بە برناردشۆیان وت تۆ ڕەزیل و سەروەت و سامانت زۆر خۆشدەویێت. چونکە هەر کەسێک چووبا لای بۆ نووسینی یادگارییەک یان وتەیەک تەنها لە بەرامبەر بڕێک پارە ئەو کارەی بۆ دەکردن، وای لێهاتبوو بۆ هەر وشەیەک دۆلارێکی وەردەگرت، جارێکیان کەسێک دەچێتە لای بۆ نووسینی وتەیەک کە تەنها یەک دۆلاری پێیە، ئەویش تەنها بە یەک وشە وەڵامی دایەوە و وتی: ((سوپاس))، بەمەش کەسەکە زۆر توڕە بوووتی:

- تۆ کەسێکی ماددی و تەنها بە دوای کۆکردنەوەی پارە و سامانەوەیت، بەڵام ئێمە بە دوای شکۆ و ئەدەبدا دەگەڕێین.

برناردشۆ زۆر بە لەسەرخۆیی وتی:

- هەرکەسەو بە دوای ئەوشتەدا دەگەڕێت کە نیەتی.

### • شەرم ناکەیت دەڵێی نازانم

- دەربارەی شتێک لە زانا (الشعبی)یان پرسی.

- ئەویش وتی: نازانم.

- وتیان: تۆ گەورە زانای عێراقی شەرم ناکەیت دەڵێی نازانم.

- ئەویش وتی: فریشتەکان شەرمیان نەکرد لە وتنی ئەم بێژەیە و:

﴿ قَالُواْ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ [البقرة: ٣٢].

## • پرسیاری بێ بنەما پێویستی بە وەڵامی بێ بنەما هەیە

ئافرەتێک کچە حەوت ساڵیەکەی دەبات بۆ لای پزیشکێکی دەروونی، پزیشکەکەش پرسیارێکی لێ دەکات و دەڵێت:

- تۆ کوڕی یان کچ؟ بیربکەرەوە دواتر وەڵامم بدەرەوە، بەڵام کچەکە بە خێرایی وەڵامی دایەوە

- وتی: من کوڕم

- پزیشکەکە وتی: ئەگەر گەورە بوویت ئارەزوو دەکەیت ببیت بە چی؟

- کچەکە وتی: حەزدەکەم ببم بە باوک.

- دایکەکە بە دەنگ هات و وتی: ئەوە چیتە کچم ئەو قسە بێ بنەما و پروپوچانە چین دەیانکەیت؟

- کچەکەش وتی: دایکە پرسیاری بێ بنەما پێویستی بە وەڵامی بێ بنەما هەیە.

## • مرۆڤ چێژ لەخەوەکەی وەردەگرێت

وەزیرێکی عەباسی (سەمامەی کوڕی ئەشرەس) بەلای شێتێکدا تێپەری، شێتەکە پرسیاری لە وەزیر کرد وتی:

- ئەی وەزیر کەی مرۆڤ چێژ لەخەوەکەی وەردەگرێت؟

- ئەویش وتی: ئەوکاتەی کە لەخەو هەڵدەستێت.

- شێتەکە وتی: جا چۆن کەسێک چێژ لە خەو دەکات کە لە خەو دابڕابێت؟

- وەزیرەکە وتی: کەواتە بەر لە خەوتن چێژ وەردەگرێت.
- شێتەکە وتی: جا چۆن کەسێک چێژ لەخەو دەکات کە هێشتا نەخەوتبێت؟
- وەزیرەکە وتی: کەواتە ئەوکاتەی کە خەوتووە.
- شێتەکە وتی: جا چۆن چێژ وەردەگرێت لەکاتێکدا هەست بە هیچ ناکات؟!
- وەزیرەکە پێی سەرسام بوو و هیچ قسەیەکی بۆ نەما و ڕۆیشت.

- **لەڕێگایەکدا منت بینیوە کە خۆت لەوێ نەبوویت؟؟**

پیاوێک وەک سەرزەنشتکردنێک بە ڕەقبەی کوڕی موسقەلەی دەڵێ:
- باشە ئەوە تۆ چیتە هەمیشە لە ڕێگا و شەقامەکان دەسوڕێیتەوە؟
ئەویش وتی: لەبەرچی ئەوەی بۆ من پێت زۆرە، بۆخۆشت پێت زۆر نیە؟ ئایا لەڕێگایەکدا منت بینیوە کە خۆت لەوێ نەبوویت؟!

- **بەشاری کوڕی بورد**

کەسێکی ڕەزا قورس و قسە ڕەق لەبەشاری کوڕی بوردی پرسی:
- هەر کەسێک خودای گەورە چاوی پێ نەدابێت بە شتێکی تر قەرەبووی کردۆتەوە، ئایا خودای گەورە بە چی قەرەبووی تۆی کردۆتەوە؟
- بەشاریش وتی: بەوەی کە تۆ و هاوشێوەی تۆ نابینیم!

### • هەر عومەرەکەی جارانم

عومەری کوڕی عبدالزیز لە مەجلیسێکدا دانیشتبوو، سەرنجیدا کە تیشکی چرای ژوورەکە کەمێک کز بووە، بۆیە هەستا و کەمێک زیادی کرد بۆ ئەوەی ڕووناکیەکەی زیاتر بێت.

یەکێک لە دانیشتوانەکەی ئەو مەجلیسەدا وتی:

- قوربان بۆچی بە ئێمەت نەوت چراکە زیاد بکەین، بۆ خۆت هەستایت؟

- ئەویش وتی: قەسەم بەخوا تیشکی چراکە زیاد بکەم یاخود کەمی بکەم، هەر عومەرەکەی جارانم!

### • بۆچی نەزەر حەڕام و قەدەغەیە؟

بە موسڵمانێکیان وت:

- بۆچی لە ئایینی ئێوەدا قەدەغەیە تەنانەت سەیری ڕووخساری کچێکیش بکەیت؟

- وتی: تاوەکو ملیۆنەها کەسی تر قەدەغەبکات لەسەیرکردنی خوشکەکەی تۆ.

### • ئایا پێشەوا عوسمانی کوڕی عەففان یەهوودی بووە؟!

ئەبو حەنیفە گوێبیستی ئەوە دەبێت کە یەکێک لە پیاوە شیعییەکان وتویەتی:

- عوسمانی کوڕی عەفان یەهوودی بووە.

ئەبو جەنیفەش دەچێتە لای و پێی دەڵێ:
- ئەی پیاو من هاتووم تاوەکو داوای یەکێک لە کچەکانت بکەم بۆ پیاوێکی دینداری لە خواترس، کەسێکی دەست پاک و ڕاستگۆ، شەوانە بەردەوام لەترسی خودا دەگری و دەپاڕێتەوە، زۆر لەسەرخۆ و بەخشندەیە....شیعەکە کاتێک ئەو وەسفانەی گوێ لێبوو دەی وت:
- بەهـ بەهـ لەو کەسە باشە. جا ئەگەر وابێت چۆن کچەکەی خۆمی نادەمێ.
- ئەبو حەنیفە: بەڵام تەنها یەک سیفەتی ئەو پیاوەم بیرچوو کە پێتی بڵێم، ئەویش ئەوەیە کە ئەو پیاوە یەهوودییە و موسڵمان نیە.
- پیاوە شیعەکە: ئەی ئیمام تۆ چی دەڵێی؟ یەهوودییە؟ خۆت دەزانی ئێمە موسڵمانین چۆن دێیە داخوازی کچکەم بۆ کەسێکی یەهوودیی؟ لەکاتێکدا خۆت باش دەزانی کە ناکرێت ئێمەی موسڵمان کچ بدەین بە یەهوودیی!!
- ئەبو حەنیفە: ئەی چۆن پێغەمبەری خودا (ﷺ) کچەکەی خۆی داوە بە عوسمانی کوڕی عەففان لەکاتێکدا خۆت دەڵێی یەهوودیی بووە؟

- **سوودی پاشەکەوت**

به دانایەکیان وت:
- تۆ تەمەنت حەفتا ساڵە هێشتا پاشەکەوت دەکەیت؟

- وتی: پیاو ئەگەر لە دوای مردنی خۆی سەروەت و سامان بۆ دوژمنەکەی جێبهێڵێ لەوە باشترە کە بەر لە مردن چاوی لەدەستی هاوڕێکەی بێت.

## • گفتوگۆی باوک و کوڕێک

- باوکێک: کوڕەکەم کاتێک ناپلیۆن لە تەمەنی تۆدا بوو، هەمیشە لەسەر ئاستی پۆلەکەی یەکەم دەبوو، بۆچی تۆ هەر پێنجەم و شەشەم دەبیت؟

- کوڕەکە: باوکە کاتێک ناپلیۆن گەیشتە تەمەنی تۆ بوو بە ئیمپڕاتۆری فەڕەنسا و هەوڵی دەست بەسەر داگرتنی هەموو جیهانی دەدا.

## • گۆشتی مێشولە حەڕامە؟

لە زانا شەعبی پرسرا:

- ئایا خواردنی گۆشتی مێشولە جائیز و ڕێگە پێدراوە؟

- وتی: ئەگەر حەزت چووە گۆشتەکەی بیخۆ جائیزە.

## • خانمێکی جوان و برناردشۆ

ڕۆژێکیان گۆرانیبێژێکی ئیرلەندی کە زۆر جوان و بەرچاو بووە دێتە لای برناردشۆ و پێی دەڵێت:

- بۆچوونت چۆنە ئەگەر پێکەوە هاوسەرگیری بکەین و منداڵێکیش بێنینە دونیا وەک تۆ زانا وبلیمەت و وەک منیش جوان بێت؟ بەمەش منداڵەکەمان دەبێتە کەسایەتیەکی نموونەیی.
- برناردشۆش داوای لێبوردنی لێدەکات و بە داواکەی ڕازی نابێت، بە گاڵتە هەمیشەییەکەی بە گۆرانیبێژە جوانەکە دەڵێت:
- بمبورە گەورەم، چونکە ڕەنگە ئەنجامی ئەو هاوسەرگیرییە خراپ و چاوەڕوان نەکراو بێت، لەوە ئەترسم منداڵەکەمان جوانیەکەی لەمن بچێت و زیرەکییەکەشی لەتۆ! بەمەش هەرگیز نموونەیی نابێت.

## • ئافرەتی چاک نیعمەتێکی گەورەیە

گەنجێک لە هاوڕێیەکی خۆی پرسی کە ماوەیەک بوو هاوسەرگیری کردبوو:
- ئایا ڕاستە دەڵێن پیاو نازانێ کە بەڵا و موسیبەت چییە تا ژن نەهێنێ؟
ئەویش زۆر ژیرانە وەڵامی دایەوە و وتی:
- بەڵکو تا بەڵاو موسیبەتت نەبێت قەدری ئافرەتی چاک نازانی!

## • وەزیری تێنەگەیشتوو

ڕۆژێکیان شا عەبباس لە یەکێک لە وەزیرەکانی دەپرسێت:
- ئەمساڵ بارودۆخی ئابووری خەڵک چۆنە؟

وەزیرەکەش زۆر بە مەردانە وتی:
- قوربان ئەمساڵ بارودۆخی ئابووری خەڵک زۆر باشە، تەنانەت پینەدۆزەکانیسش چوون بۆ حەج!!

شاش وتی:
- هەی گەمژە ئەگەر بارودۆخی خەڵک باش بێت ئەوا پێڵاو فرۆشەکان دەچن بۆ حەج نەک پینەدۆز و پینەچییەکان، چونکە ئەگەر حاڵی خەڵک باش بێت پێڵاوی دراو چاک ناکاتەوە، بەڵکو هی نوێ دەکرێت.

## • پیاوێکی کوێر و ژنەکەی

پیاوێکی کوێر ژنێکی هێنا، ژنەکەی پێی وت:
- ئەگەر تۆ جوانی و سەرنجڕاکێشی منت بینیبا دڵنیام سەرسام دەبووی.
- پیاوە کوێرەکەش وتی: دڵنیام ئەگەر تۆ بەو شێوەیە نیت، وەک باسی خۆت دەکەیت، چونکە ئەگەر وابایت ئەوا چاوساغەکان بۆمنیان جێ نەدەهێشتی!

## • ژن و مێردێک

دەگێڕنەوە کەوا پیاوێک بە ژنەکەی وتووە:
- خودای گەورە لە تۆی خۆشەویستر بۆ من دروست نەکردووە.

- ژنەکەش وتی: خودای گەورە لە تۆی بێزارتر بۆ من دروست نەکردووە.
- پیاوەکە وتی: سوپاس بۆ خوا کە ئەوەی خۆشمدەوێ بەمنی داوە، ئەوەی ڕقیشی لێدەبێتەوە و بە تۆی داوە!

- ئایا چێشت لێنەر لە شاعیر و ئەدیب بەسوودتر نیە بۆ گەل؟
- پیاوێک بە برناردشۆی وت: ئایا چێشت لێنەر لە شاعیر و ئەدیب بەسوودتر نیە بۆ گەل؟
- ئەویش وتی: سەگەکان بۆچوونیان وایە.

- جیگای پسمارک

بە پسمارکی (گەورە سیاسەتمەداری ئەوروپا لە سەردەمی خۆیدا)یان وت: تۆ بانگهێشت کراویت بۆ بەشداری کردن لە ئاهەنگێک، بەڵام ڕێکخەران شوێنێکی نەگونجاویان بۆ پسمارک دانابوو، بەڵام دوای ئەوەی کە سەرپەرشتیاری ئاهەنگەکە زانی بە خێرایی چوو بۆ لای و داوای لێبوردنی کرد و وتی:
- ((بمانبورە گەورەم، چونکە پێویست بوو تۆ لە شوێنی سەرەکی دابنیشتبای))
- ئەویش وتی: ((پێویست بە پەشۆکان و داوای لێبوردنت ناکات.. پسمارک لە هەرشوێنێک دابنیشێت ئەوێ شوێنی سەرەکییە)).

### • ئایا ماڵی باوکت گەورەترە یان ماڵی ئەمیر

ڕۆژێکیان یەکێک لە ئەمیرە گەورەکان سەردانی ماڵی یەکێک لە گەورە فەرمانبەرەکانی دەکات، فەرمانبەرەکە منداڵێکی زۆر زیرەک و ژیری هەبوو، بەجۆرێک کە ئەمیر پێی سەرسام بوبوو، بۆیە ئەمیر ویستی تاقی بکاتەوە و ئاستی ژیری هەڵبسەنگێنێت، لێی پرسی:

- ئایا ماڵی باوکت گەورەترە یان ماڵی ئەمیر؟

منداڵەکە کەمێک بیری کردەوە، نەیدەزانی خۆشەویستی بۆ باوکی دەربخات، یاخود گەورەیی بۆ ئەمیر بنوێنێ بۆیە بە ژیرانە وتی:

- چونکە ئەمیر لە ماڵی ئێمەیە، ماڵی باوکم گەورەترە لە ماڵی ئەمیر.

### • کامیان گەورەترە

فەرمانڕەوایەک سەردانی یەکێک لە شێخ و زاناکانی ژێر حوکمڕانی خۆی دەکات، فەرمانڕەوا تەمەنێکی مامناوەندی هەبوو، بەڵام شێخەکە بەتەمەن و پیربوو، یەکێک لە هاوەڵانی حوکمڕانەکە بۆ ئەوەی پیاوە پیرەکە بخاتە مەوقیفەوە پرسیارێکی لێکرد و وتی:

- ئەی شێخ تۆ گەورەتری یاخود فەرمانڕەوا؟

- شێخەکەش زۆر بە لێزانانە وەڵامی دایەوە و وتی: فەرمانڕەوا لە من گەورە، بەڵام من بەر لەو لەدایک بوومە.

### • بە کام ڕووەوە من دەبینی؟!

پیاوێکی تاوانبار هاتە لای فەرمانڕەوا: فەرمانڕەواش پێی وت: بە کام ڕووە من دەبینی؟!

- پیاوەکەش وتی: بەو ڕووەی کە لە ڕۆژی دواییدا خودای گەورەی پێ دەبینم،
لەکاتێکدا تاوانەکانم زۆر گەورەتر و زیاترن و سزای ئەویش گەورەتر و بەهێزتر...
- فەرمانڕەوا بە وەڵامەکەی سەرسام بوو، بۆیە ئازادی کرد.

- **گەنجێک و ئەسکەندەر دیماس**

گەنجە نووسەرێک دەچێتە لای ڕۆماننووسی گەورە و ناوداری فەڕەنسی (ئەسکەندەر دیماس) نووسەری ڕۆمانی (سێ سوارچاکەکە) و چەند نووسینێکی تر..، گەنجەکە داوای لێکرد کە هاوکاری بکات لە نووسینی یەکێک لە چیرۆکە تاریخییەکان..
- دیماسیش بە گاڵتە پێکردنەوە وەڵامی دایەوە و وتی: جا چۆن ئەسپ و کەرێک دەتوانن لە ڕاکێشانی عەرەبانیەکدا یارمەتی یەکتر بدەن؟
- گەنجەکەش زۆر بەخێرایی وەڵامی دایەوە و وتی: گەورەم ئەوە سوکایەتی پێکردنە، چۆن ڕێگە بەخۆت دەدەیەت من بە ئەسپ بچوێنی؟(واتە ئەو کەرەکەیە).

- **نێوانی ئاسمان و زەوی چەندە؟**

کەسێک لە پێشەوا عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) دەپرسی: ئایا نێوانی ئاسمان و زەوی چەندە (دیارە مەبەست پێی تاقیکردنەوەی پێشەوا بووە).

- ئەویش وتی: نێوانیان تەنها نزایەکی وەرگیراوە و وەڵامدراوەیە.
- ئینجا پرسی: ئەی نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا چەندە؟
- وتی: ماوەی ڕۆژێکە بۆ خۆر، بەمەش کابرا بێ دەنگ بوو.

## • بۆچی مێردت بە شوێنەوارناس کرد؟

کاتێک پرسیاریان لە ژنە نووسەری ئینگلیز (ئەغاسا کریستی) کرد، کە ئاخۆ بۆچی مێردت بەو پیاوە کرد کە کاری شوێنەوار دەکات؟ وتی: بۆ ئەوەی تا کۆنتربم خۆشەویستربم لای ئەو (کەسانی شوێنەوار ناس هەمیشە زیاتر گرنگی بە شتی کۆن و مێژوویی ئەدەن).

## • بەر لە سێ سەد ساڵ ڕزقت بۆ دانراوە

زانایەک لە کەسێکی پرسی:
- ئەو ڕۆژگارە بەلای تۆوە چۆنە؟؟
کەسەکەش بە بێزاری و بێ تاقەتیەکی زۆرەوە وتی:
- لەتاو برسیەتی وا ناچارم کە ئەو گۆزە گڵینە بفرۆشم، کە سێ سەد ساڵ لەمەوبەر باب و باپیرانمان دروستیان کردووە، تەنها بۆ ئەوەی چەند لەتە نانێکی پێبکڕم...
زاناکەش وتی:
- بەر لە سێ سەد ساڵ خودا هۆکاری ڕزقی بۆ دەستەبەر کردووی، کەچی تۆ دانیشتووی و ناشوکری دەکەیت!

## • زانایەکی موسڵمان و بێ باوەڕێک

ڕۆژێکیان یەکێک لەو کەسانەی کە باوەڕی بە خودا نەبوو (ملحد) تەحەدای زانا موسڵمانەکانی ئەو ناوچەیەی کرد کە تیایدا دەژیا، لێهاتووترین و زیرەکترین زانای ناوچەکەی هەڵبژارد تاوەکو وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە، دواتریش وادەیەکیان دانا بۆ گفتوگۆکەیان .

لەو ڕۆژەی کە دیاریان کردبوو هەموان چاوەڕێی زاناکەیان دەکرد، بەڵام ئەو دواکەوت. کابرای بێ دین وتی:

- سەیربکەن زاناکەتان هەڵاتووە و ترساوە و زانیویەتی کە شکست دەهێنێت بۆیە نەهاتووە، ئێستا بزانن کە ئەم گەردونە هیچ دروستکەرێکی نیە! بێ دینەکە لەو قسانە دابوو زاناکە بەدیار کەوت و گەیشتە شوێنی دیاری کراو، پاشان داوای لێبوردنی لە بێ دینەکە کرد لەسەر دواکەوتنەکەی، پێی وت:

- من لە ڕێگادا بووم تاوەکو بێم بۆ ئێرە، بەڵام هیچ بەلەمێکم دەست نەکەوت تاوەکو لە ڕووبارەکەدا پێی بپەڕمەوە، بۆیە لەکەنار ڕووبارەکە چاوەڕێم کرد، لە ناکاو هەندێک پارچە تەختە لە ناو ڕووبارەکە دەرکەوتن، پارچەکان خۆیان کۆکردەوە و تا لە خۆیان بەلەمێکیان دروست کرد، دواتریش بەلەمەکە لەمن نزیک بوویەوەو منیش سەری کەوتم پێی هاتم بۆ ئێرە.

بێ دینەکە بە خێرایی وەڵامی ئەو قسانەی زانا موسڵمانەکەی دایەوە و وتی:

- خەڵکینە سەیر بکەن زاناکەتان شێت بووە، چۆن هەر لە خۆوە پارچە تەختە خۆیان کۆ دەکەنەوە و دەبن بە بەلەم؟ بێ ئەوەی کەسێک دەستیان لێبدات؟ هەروەها چۆن جوڵە دەکەن بێ ئەوەی کەسک هەبێت بیان جوڵێنێت؟ لەو کاتەدا زاناکە پێکەنی وتی:

- ئەی کەواتە چی بەخۆت دەڵێیت: لە کاتێکدا تۆ دەڵێیت ئەم گەردونە گەورە لە خۆوە دروست بووە و هیچ دروستکەرێکی نیە!

## • پیاوێک و پیاوێکی دانا

پیاوێک لە کەسێکی دانای پرسی: براکەت چۆنە -دیارە کە نەخۆش بووە-؟

- ئەویش وەڵامی دایەوە و وتی: براکەم مرد.

- پیاوەکە: هۆکاری مردنەکەی چی بوو؟

- پیاوە داناکە: هۆکاری مردنەکەی ژیانی بوو.

## • گفتوگۆی دووپیاوی دانا:

- دانایەک: لە دەرگای ماڵی مندا خراپ بۆی نیە بێتە ژوورەوە.

- داناکەی تر: ئەی خۆت و ژنەکەت لە کوێوە دەچنە ژوورەوە؟

## • گفتوگۆی نێوان دووپیاو

پیاوێک دەبینێ دوو پیاوی تر چپەچپ دەکەن

- ئەویش لای ناخۆش دەبێت و وادەزانێ بەخراپ باسی ئەو دەکەن، بۆیە دەڵێت: ئەوە سەبارەت بەچی درۆ دەکەن.

- یەکێک لە پیاوەکانیش وەڵامی دایەوە و وتی: درۆکەمان تەنها ئەوەیە کە ستایش و مەدحی تۆمان کرد.

## • شێت و عاقڵێک

- پیاوێک بە شێتێک دەڵێت: ئایا هیچ مەیت لا نیە بینۆشم؟
- شێتەکە: عاقڵەکان مەی دەنۆشن تاوەکو وەکو منیان لێبێت، ئەی من بۆ بینۆشم، تا وەکو کێم لێبێت؟

## • بەهول و پزیشکێک

هارونە ڕەشید پزیشکێکی یۆنانی بۆ بەغداد بانگهێشت دەکات.
ڕۆژێکیان کوڕێک دەبەستن و بالولیش ئامادەی ئەو کوڕە دەبێت، پزیشکەکە بە گێل لە بالول گەیشتووە، بۆیە ڕووی تێ دەکات و بە گاڵتەوە دەڵێت:
- بالول تۆ دەزانی من مردوو زیندوو دەکەمەوە؟؟؟
بالولیش زۆر خێرا وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:
- قوربان تۆ زیندووەکان مەکوژە، واز لە مردووەکان بهێنە.

## • ئەمیر و مامۆستای کوڕەکەی

- ئەمیر بە مامۆستای کوڕەکەی دەڵێت: مامۆستا بەر لە نووسین مەلەوانی فێربکە.
- مامۆستا: بەڵام ئەی ئەمیر نووسین گرنگترە لە مەلەوانی.

- ئەمیر: بەڵێ نووسین، گرنگە، بەڵام مەلەوانی پێویسترە، چونکە ئەگەر نووسین نەزانێت کەسێک دەبێت بۆی بنووسێت، بەڵام ئەگەر مەلەوانی نەزانێت، کێ مەلەوانی لە جیاتی دەکات؟

• پادشا و وەزیرەکەی

- پادشایەک بەوەزیرەکەی دەڵێ: ئای چەند باشدەبوو ئەو دەسەڵات و موڵک و سامانەم بەردەوام بوایە...

- وەزیرەکەی: ئەگەر بۆ کەسێکی تر بەردەوام بوایە، ئەوا بەتۆ نەدەگەیشت.

• ئەگەر پیاوێک ویستی خێر و

• چاکە بکات چی بکات بەخێر باشە؟

- بە ئەبو عوبەیدە وترا: ئەگەر پیاوێک ویستی خێر و چاکە بکات چی بکات بەخێر باشە؟

- ئەویش وتی: چەند درهەمێک بکات بەخێر.

- وترا: ئەگەر ئەوی نەبوو؟

- وتی: بە درهەمێک.

- وترا: ئەگەر ئەوەشی نەبوو؟

- وتی: بە خورمایەک.

- وترا: ئەگەر نەیبوو؟

- وتی: بەلەتە خورمایەک.

- وترا: ئەگەر ئەوەشی نەبوو؟

- وتی: با یارمەتی لیقەوماوێک بدات.
- وترا: ئەگەر نەیتوانی؟
- وتی: با قسەیەکی خێر بکات.
- وترا: ئەگەر نەیتوانی ئەو قسەیەش بکات؟
- وتی: هەورەتریشقەیەک دابەزێت وبیکوژێت، تاوەکو لەکۆڵ عیباد و بیلاد ببێتەوە.

## • ئافرەتێکی جوان و پیاوێکی هەژار

ڕۆژێکیان: ئافرەتێکی زۆر جوان بەلای پیاوێکی هەژار تێپەڕدەبێت، پیاوەکە بە جوانی ئەو ئافرەتە سەرسام دەبێت و دڵی پەیوەست دەبێت پێیەوە، بۆیە لێی دەچێتە پێشەوەو ئەم گفتوگۆیە لەنێوانیاندا ڕوودەدات:

- پیاوەکە: "وزیناها للناظرین"
- ئافرەتەکە: "وحفظناها من کل شیطان رجیم"
- پیاوەکە: "بل هی فتنة ولکن أکثرهم لا یعلمون"
- ئافرەتەکە: "واتقوا فتنه لا تصیبن الذین ظلموا منکم خاصة واعلموا أن الله شدید العقاب"
- پیاوەکە: "نرید أن نأکل منها وتطمئن قلوبنا"
- ئافرەتەکە: "لن تنالوا البر حتی تنفقوا"
- پیاوەکە: "وإن کان ذو عسرة"
- ئافرەتەکە: "حتی یغنیهم الله من فضله"

- پیاوەکە: و"الذین لا یجدون ما ینفقون"
- ئافرەتەکە: "أولئک عنها مبعدون"
- لەو کاتەدا پیاوەکە ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و وتی: ألا لعنة الله علی نساء الأرض أجمعین.
- ئافرەتەکە: للذکر مثل حظ الأنثیین.

## • وەڵامێکی شێخ ناسرەدینی ئەلبانی

- پیاوێک هاتە لای شێخ ناسڕەدینی ئەلبانی و وتی :
- من علمی غەیب دەزانم .
- شێخیش فەرمووی: کەواتە من لەسەر ئەو بابەتە گفتوگۆت لەگەڵدا دەکەم، بەڵام بە مەرجێک.
- پیاوەکەش وتی: باشە مەرجەکەت چییە؟
- شێخ فەرمووی : تۆ چۆن علمی غەیب دەزانی لەکاتێکدا کە نازانی مەرجەکەی من چییە؟!
مناقەشەکەش لێرەدا کۆتایی هات!

## • ژنێکی قەڵەو

- ژنێکی "قەڵەو" سواری پاسێک بوو، یەکێ لە سەرنشینەکان بەتوانجەوە وتی :
- نەمزانی ئەم سەیارەیە بۆ گواستنەوەی فیلە!
- ژنەکە زۆر بەهێمنی وەڵامی دایەوە :

- نـا بـەرێزم ئـەم سـەیارەیە وەک و کەشـتی نـوح وایـە، فیلـیش سەردەکەوێ و (کەر) یشی سەردەکەوێ!

## • موتەنەبی و پیاوێک

موتەنەبی شاعیر پیاوێکی قژ درێژبوو

- پیاوێک پێی وت : لە دوورەوە بینیمی وامزانی ژنی !

- ئەویش وەڵامی دایەوە : منیش لەدوورەوە بینیمی وامزانی پیاوی !!

## • تۆ گەورەتری یان پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟

لە هاوەڵی بەڕێز (عەباس)یان پرسی:

- تۆ گەورەتری یان پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟

- وتی: پێغەمبەری خودا گەورەترە، بەڵام من پێش ئەو لەدایک بوومە!!

## • ژن و پیاوێک

- ژنێکی "زۆر ناشرین" بەپیاوێکی وت: ئەگەر مێردی من بویتایە ژەهرم دەکردە قاوەکەتەوە.

- پیاوەکەش وتی :ئەگەر تۆش ژنی من بویتایە یەکسەر دەمخواردەوە!

## • وەڵامی جنێو!

- جنێویان بە پیاوێکی دانا دا

وەڵامی نەدایەوە.

- لێیان پرسی : بۆ وەڵامت نەدانەوە ؟

- وتی : ناچمە جەنگێکەوە کە براوەکەی خراپتر بێت لە دۆڕاوەکەی .

## • پێشەوا غەزالی و گەنجێک

- گەنجێک پرسیاری لە پێشەوا غەزالی کرد وتی: حوکمی ئەو کەسە چیە کە نوێژ ناکات؟

- فەرمووی: حوکمی ئەوەیە دەستی بگریت وببیەیت بۆ مزگەوت.

" تۆ بانگخواز بە نەک حاکم "

## • وەڵامێکی پێشەوا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز

جارێکیان پێشەوا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (خودا لێی ڕازی بێت) لەلای دەرگای مزگەوت دانیشتبوو چاوەڕێی بانگی بەیانی دەکرد، پیاوێک کە خەڵکی ئەو شارە نەبوو و عومەری نەدەناسی و نەیدەزانی خەلیفەی موسوڵمانانە، هاتە ژوورەوە و قاچی بەر قاچی عومەر کەوت و زۆر بە تووڕەییەوە بە عومەری گووت:

- تۆ کـــەری؟!

- عومەریش زۆر بە لەسەرخۆیی وەڵامی دایەوەو وتی: نەخـێر!

- هاوەڵەکانی عومەر هەستانەوە و گووتیان: ئەی عومەر، ئەم پیاوە چی پێوتی؟ ئێمە قەبووڵی ناکەین!

- پێشەوا عومەریش رووی تێکردن و وتی: لێیگەڕێن تەنها پرسیارێکی کرد و وتی : تۆ کەری؟!

- منیش وەڵامم دایەوەو وتم : نەخێر.

## • پیاوێکی موسڵمان و سەرتاشێک

موسڵمانێک دەچێتە لای سەرتاشێک بۆ ئەوەی سەری چاک بکات کاتێک سەرتاش مقەست و شانە بەدەستیەوە دەگرێت،پێش ئەوەی سەری موسڵمانەکە چاک بکات کەمێک پێکەوە قسە دەکەن و سەرتاشەکە دەڵێت خودا نیە!!

لێرەوە ئەم گفتوگۆیە ڕوو دەدات:

- سەرتاش دەڵێت: خودا نیە !!

- موسڵمانەکە دەڵێت : چۆن وادەڵێی ؟

- سەرتاش: ئەگەر خودا هەیە ئەی ئەم هەموو شەڕ و کوشتار و نادادپەروەری و خراپەکارییە چیە لەسەر زەویدا ؟

- موسڵمان: کەواتە تۆ سەرتاش نیت ، سەرتاشیش بونی نییە!!

- سەرتاشەکە توڕە دەبێت و دەڵێت : بۆچی وادەڵێی؟

- موسڵمان: ئەی ئەگەر تۆ سەرتاش بیت ئەی ئەم هەموو مرۆڤە قژ درێژ و ناشیرینە چییە لە سەر زەویدا؟ ئەی ئەوە دادپەروەرییە ؟

سەرتاش: ئەو خەڵکە خۆیان نایەن بۆلای من هەتا قژیان بۆ چاک بکەم و دیمەنێکی جوانیان هەبێت...

موسڵمان: دەی کەواتە ئێمەی مرۆڤیش خۆمان نارۆین بۆلای خودا و خودامان لەبیر خۆمان بردۆتەوە و ڕومان کردۆتە دونیا و هەر

خەریکی فێڵ کردن و کوشتنی یەکترین و خۆمان شەڕ و ئاژاوەمان ناوەتەوە و خودامان لەبیر کردووە.

پەروەردگاریش دەفەرمووێت: ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ﴾ [البقرة: ١٥٢] واتە: ((دەی کەواتە) ئەی ئیمانداران ئەگەر یادی من بکەن، منیش یادی ئێوە دەکەم و سوپاسگوزاری من بن و سوپاس ناپەزێر و سپڵەیی بەرامبەرم مەکەن)).

### • دەترسم ڕۆژێک خانووەکەت سوژدە ببات!!

ڕۆژێکیان پیاوێک دەچێت بۆ ماڵی هاوڕێیەکی، دەبینێ سەقفی خانووەکەی زۆر خراپ بووە، بۆیە پێی دەڵێ:

- ئەوە بۆ ئەو دار و کاریتانە چاک ناکەیت، لە کۆنیان جیرە جیریان دێت؟

خاوەن ماڵەکەش دەڵێت:

- نا خراپ نەبوونە، ئەوانە یادی خودا دەکەن.

پیاوەکەش دەڵێت:

- ئاخر دەترسم ڕۆژێک سوژدە ببەن!

### • خەڵکی گوندێک و بێ دینێک

جارێک بێ دینێک (ملحد) دەچێت بۆ لادێیەک، لە ناخی خۆیدا وتی: ئێستا خەڵکی ئەم لادێیە هەموویان لەدین هەڵدەگەڕێنمەوە! بۆیە خەڵکەکە کۆدەکاتەوە و دەڵێت: خەڵکینە ناڵێن خوا باران دەبارێنێ!

ئێستا منیش ئەو کارە دەکەم! ئاگرێکی کردەوە و مەنجەڵیک ئاوی خستەسەر، پاش ماوەیەک، سەری مەنجەڵەکەی هەڵدایەوە، چەند دڵۆپە ئاوێک بەسەری مەنجەڵەکەوە نوسابوون، وتی: خەڵکینە سەیرکەن بارانیش ئاوا دەبارێ!

(پیرە مێردێکیش) کە لەو لاوە لەسەر بەردێک دانیشتبوو هەستایەوە و وتی: ئەگەر ئازاو پیاویت بۆمان دەکەیتە بەفر!

## • وەڵامی کارگوزارێک

- گەنجێک بەسوکایەتیەوە بەکارگوزارێکی وت:

جەنابی بەرێوبەر خۆڵ و خاشاک کیلۆی بەچەندە؟

- کارگوازارەکەش وتی: تۆ جارێ تامی بکە، لەسەرنرخەکەی رێک دەکەوین.

## • دونیا نەویستی حەسەنی بەسرِی

- لە حەسەنی بەسرِییان پرسی: بۆ چی لەم دونیایەدا زاهیدانە دەژی و گرنگی بە شتە دنیاییەکان نادەیت؟

- حەسەنی بەسریش وتی: زانیم ئەو کارەی من دەیکەم کەسیتر نایکات، بۆیە خەریکی کاری خۆم بووم ..

هەروەها زانیم رزقی من بۆ کەسێکی دیکە ناچێت و دڵم ئارام بوو ..

هەروەها زانیم خوای گەورە ئاگاداری هەموو شتێکە، بۆیە شەرمم کرد لەکاتی خراپەکردن بمبینێت..

هەروەها زانیم، مردن چاوەڕێم دەکات، لەبەر ئەوە خۆم بۆ ئامادە کرد..

## • دانایی مامۆستایەک

- ڕۆژێکیان مامۆستایەک لەسەر تەختە ڕەشی یەکێک لە پۆلەکان ئەمانەی نووسی:

٥= ١X٢

٤= ٢X٢

٦= ٣X٢

٨= ٤X٢

١٠= ٥X٢

١٢= ٦X٢

١٤= ٧X٢

١٦= ٨X٢

١٨= ٩X٢

٢٠= ١٠X٢

کاتێک تەواو بوو، سەیری قوتابییەکانی کرد، بینی کە هەموویان پێی پێدەکەنن لەبەر یەکەم لێکدان کە بە هەڵە نووسیبوی، بۆیە پاش کەمێک مامۆستاکە وتی:

- من بە مەبەست یەکەم دانەم بە هەڵە نووسی، چونکە ویستم کە شتێکی گرنگ فێرببن. ئەویش ئەوەیە کە تێبگەن و بزانن کە جیهانی

دەرەوەی ئەم پۆلە چۆن ڕەفتارت لەگەڵ دەکەن. ئەتوانن خۆتان ببینن کە من ٩ جار لێکدانەکەم ڕاست نووسیوە، بەڵام کەستان دەستخۆشیتان لێ نەکردم لەبەرامبەر ئەوەدا، کەچی هەمووتان پێکەنین و ڕەخنەتان گرت لەبەرئەوەی تەنها یەک دانەیانم بە هەڵە نووسیوە، بۆیە ئەمە ئەو وانەیەیە کە لەم بابەتەدا هەیە:
"جیهان نرخی ئەو کارە باش و دروستە نازانن کە ملیۆنەها جار ئەیکەیت، بەڵام ڕەخنە لەو تاکە کارە هەڵەیەت دەگرن کە ئەیکەیت".

## • ترسان لە خودا

گەنجێک باسی خراپەی نەفسی خۆی لای شێخێک دەکات: من گەنجێکی بچووکم، هیوا و ئارەزووەکانم زۆرن، ناشتوانم لە بازاردا چاوەکانم بپارێزم و سەیری کچ و ئافرەتان نەکەم، پێم بڵێ چی بکەم؟
ئەو شێخە دانایەش کوپێک شیری پڕی پێدەدات، داواشی لێدەکات کە بیبات بۆ شوێنێکی دیاریکراو لە بازاڕی شار...بەبێ ئەوەی هیچ لە شیرەکە بڕژێ.
یەکێک لە قوتابییەکانیشی بانگ دەکات، پێی دەڵێ: هەر کاتێک ئەو گەنجە شیرەکەی ڕشت، تۆش لە پێش چاوی خەڵک لێیبدە.
بەڵێ...ئەو گەنجە شیرەکەی گەیاندە شوێنی دیاریکراو، بەبێ ئەوەی هیچ لە شیرەکە بڕژێ...کاتێک گەڕانەوە بۆ لای شێخەکە، شێخ لێی پرسی:

- ئایا چەند کچ و ئافرەتت لە ڕێگادا بینی؟
- گەنجەکە: قەسەم بەخوا هیچم نەبینی...چونکە من بیرم هەر لای ئەوەبوو کە شیرەکە نەڕژێت و قوتابییەکەت لەبەر چاوی خەڵک لێم نەدات...
- ئەوسا شێخەکە وتی: کەواتە نموونەی باوەڕداریش بەمشێوەیەیە، باوەڕدار ئەگەر تاوانێک ئەنجام بدات ئەوا لە خودا و ڕیسوابوونی لە ڕۆژی قیامەت دەترسێ...

## • من تەنها یەک کوڕ دەبینم

سێ ژن ئەیانویست لە سەر کانی ئاو بهێنن.
لەولای کانییەکەوە پیرێکی دنیادیدە دانیشتبوو و گوێی لێ بوو کە ژنەکان هەر کام چۆن وەسفی کوڕەکەی خۆیان دەکرد.
- ژنی یەکەم: کوڕەکەم یاریزانی جومناستیکە و زۆر شارەزایە و جوڵەی زۆر جوان ئەکات.
- ژنی دووەم: کوڕەکەی من وەکوو بولبول ئاواز دەخوێنێت و هیچ کەس دەنگی هێندەی ئەو خۆش نییە.
ژنی سێیەم بێدەنگ بوو و لێیان پرسی:
ئەی بۆ تۆ هیچ ناڵێیت؟
- وتی: کوڕەکەم شتێکی تایبەتی نییە شیاوی باسکردن بێت، ئەو کوڕێکی ئاساییە و هیچ تایبەتمەندییەکی نییە.
سێ ژنەکە سەتڵەکانیان پڕ کرد و بەرەو ماڵ بەڕێ کەوتن.

پیرەمێردەکەش هێواش هێواش بە دوایاندا دەڕۆیشت.

سەتڵەکان قورس بوون و دەستی ئەوانیش لاوازبوو، بۆیە لە نیوەی ڕێگا بۆ پشوودان کەمێک دانیشتن.

لەو کاتەدا هەر سێ کوڕەکە پێکەوە بەو شوێنە تێپەڕدەبوون.

کوڕی یەکەم لە سەر دەستەکانی وەستا و چەند تەقلەیەکی لێدا.

- ژنەکان وتیان: چ کوڕێکی بهەرەمەند و شارەزایە.

کوڕی دووەم وەکو بولبول دەستی کرد بە گۆرانی وتن و ژنەکانیش بە تاسەوە گوێیان بۆ شل کردبوو.

کوڕی سێیەم بەرەو لای دایکی ڕۆیشت و سەتڵەکەی لێ وەرگرت و بەرەو ماڵ بەڕێ کەوت.

- ژنەکان لە پیرەپیاوەکەیان پرسی: ڕای تۆ سەبارەت بە کوڕەکانمان چییە؟

- پیرەپیاوەکە بە سەرسوڕمانەوە وتی: کام کوڕانە دەڵێن؟ خۆ من تەنها یەک کوڕ دەبینم.

## • ڕۆژگار چییە؟

- لە موعاویەیان پرسی ڕۆژگار و زەمانە چییە؟

- ئەویش وتی: تۆ ڕۆژگاری، ئەگەر خۆت باشبووی ئەویش باش دەبێت، ئەگەر خراپیش بوویت، ئەوا ئەویش خراپ دەبێت...

## • ئەشعەب و کەرەکەی

ئەشعەب کەرەکەی ڕادەکێشا، لەوکاتەشدا پیاوێک بەلایدا ڕەت دەبێت و بەگاڵتەوە پێی دەڵێت:

- ئەشعەب لە دوورەوە کەرەکەتم ناسیەوە، بەڵام تۆم نەناسیەوە.

- ئەشعەبیش هەر باگاڵتەوە وتی: جا خۆ سەیر لەوەدانەیە، کەرەکان باش یەکتر دەناسن.

## • هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی شەل

کەسێک لە زانا "شەعبی"ی پرسی:

من هاوسەرگیریم کرد، بەڵام کاتێک هاوسەرەکەم بردە ماڵەوە بینیم شەلە، لەکاتێکدا پێشتر ئەوەیان پێ نەوتبووم، ئایا بۆ ماڵی باوکی بگێڕمەوە؟

ئەویش وتی: ئەگەر بە نیازی پێشبڕکێی پێبکەیت ئەوا بیگێڕەوە.

## • چۆن دەفتەری کردەوەکانت پڕدەکەیتەوە؟

کەسێک جنێوی بە خالیدی کوڕی وەلیددا (خودای لێی ڕازی بێت)، ئەویش تەنها وتی:

- دەفتەری کردەوەکانت چۆن پڕ دەکەیتەوە پڕی بکەرەوە!

## • لەناو نانی تۆش درۆیان کردووە

پیاوێکیان هێنا بۆ لای عوریانی کوڕی هەیسەم کە ئەمیری کوفە بوو، وتیان: گەورەم ئەو پیاوە بەوە تاوانبارە کە بە دوای ژنان دەکەوێت و زۆر ژنانیە...ئەویش بە پیاوەکەی وت:

- تۆ شەرم ناکەیت بەو تەمەنەوە بە داوی ژنان دەکەویت؟

- پیاوەکەش وتی: ئەی ئەمیر ڕاست ناکەن و درۆم بۆ هەڵدەبەستن، هەروەک چۆن لە ناونانی تۆش درۆیان کردووە!

- ئەمیر: چۆن لە ناونانی من درۆیان کردووە، چیان دەربارەی من وتووە؟

- پیاوەکە وتی: ئێ ئەوەتا ناویان ناوی (عریان) (لە زمانی عەرەبی واتە: ڕووت و ڕەجاڵ) کەچی بیست جوبەشت هەیە!!

## • خەڵک گەیشتە سەر مانگ، تۆ هەر لێرەی؟

دەگێڕنەوە جارێک پیاوێک دەچێتە لای شێخێک، لە کاتێکدا ئەو شێخە سەرقاڵی شیکردنەوەی پەرتووکی (صحیحی بوخاری و موسلیم)ە، ئەو پیاوە بە شێخەکە دەڵێ:

- ڕۆژئاوا گەیشتە سەرمانگ تۆ هێشتا لێرەی و سەرقاڵی ئەو پەرتووکانەی؟

- شێخەکە: سەیر لەوەدانیە، دروستکراوێک گەیشتووە بە دروستکراوێکی تر، بەڵام ئێمە دەمانەوێ بە دروستکار بگەین!

## • پێش قسە کردن چی بکەین؟

ئەگێڕنەوە کە جارێکیان ناسیاوێکی سۆقرات بە خێرایی دێت بۆ لای سۆقرات بۆ ئەوەی هەواڵێکی سەبارەت بە یەکێک لە قوتابیەکانی پێبگەیەنێت.

کەسەکە بەسۆقراتی وت :

- ئەو هەواڵەت بیستووە کە من بیستوومە دەربارەی یەکێک لە قوتابییەکانت؟

- سۆقرات: ساتێک چاوەڕێبە بەر لەوەی کە ئەو هەواڵەم پێ بلێیت حەز دەکەم تاقی کردنەوەیەکی بچووکت بە فلتەر پێ بکەم، ئەبێت تیایدا دەرچیت، پاشان ڕێگەت دەدەم کە هەواڵەکەتم پێبدەی، کەپێی دەڵێن سێ فلتەری یاخود سێ پرسیارەکە!!

- پیاوەکە بەسەرسوڕمانەوە وتی: سێ فلتەری؟!

- سۆقرات وتی : بەڵێ، سێ فلتەری ... بۆ ئەوەی لەڕێگەی ئەو سێ فلتەرەوە بزانم ئاخۆ ئەوەی دەیلێیت ڕاستە یان نا.

فلتەری یەکەم : فلتەری ڕاستی یە!

ئایا تۆ دڵنیایت لەو هەواڵە کە ڕاستە؟

- پیاوەکە وتی: نەخێر منیش بیستوومە!

- سۆقرات وتی: باشە کەواتە تۆ هیچ دڵنیانیت لە دروستی و نادروستی ئەو هەواڵەی کە نیازت هەیە بە منی بلێیت!

با فلتەری دووەم تاقی کەینەوە: کە فلتەری باش یان خراپیە!

- ئایا ئەو هەواڵە باشە یان خراپە؟!
- پیاوەکە وتی: نەخێر باش نیە بە پێچەوانەوەیە.
- سۆقرات پێی وت : کەواتە تۆ هەواڵێکی خراپ بە من دەڵێیت و دڵنیاش نیت لە ڕاستییەکەی !
- پیاوەکە هەستی بە شەرمەزاری دەکرد، بەڵام سۆقرات بەردەوام بوو وپێی وت:
دەرفەتت ماوە کە لە فلتەری سێیەم دەربچیت!
فلتەری سێ یەم، کە فلتەری سوودە!
- ئایا ئەو هەواڵە سوودی هەیە بۆ من، یان بۆ تۆ؟!
- پیاوەکە لە وەڵامدا وتی : لە ڕاستیدا نەخێر !
- ئەوسا سۆقرات وتی: کەواتە ئەتەوێت هەواڵێک بە من بڵێیت کە ڕاست نیە ، و باش نیـــە و هیچ سوودێکیان نرخێکی بۆ من تیا نیـــە! کەواتە بۆچی دەتەوێت ئەو هەواڵەم پێ بدەیت ؟

- **پەیوەندیەکە لەژێر چاودێریدایە**

کچێکی دەنگ خۆش پەیوەندی بە کوڕێکەوە دەکات و لە ئەحوالی دەپرسێت، بەڵام ئەو نایناسێت.
- کوڕەکە: ئێوە کێن؟
- کچەکە: من کچێکی جوان و خاوەن ماڵ و سامان و خانەوادەیەکی دیارم، حەزدەکەم تۆ بناسم.
- کوڕەکە: کەمێک بێ دەنگ بوو...پاشان وتی: بەڵام پەیوەندییەکە لە ژێرچاودێری دایە!!

- کچەکە بە سەرسامیەوە پرسی: لەلایەن کێوە چاودێری دەکرێ؛ ئایا لەلایەن ئەو دامەزراوەیەی کە کاری تێدا دەکەیت چاودێری لەسەرە؟؟

کوڕەکە: نەخێر.

- کچەکە: ئەی لەلایەن دەزگا هەواڵگری و جاسووسیەکانەوە؟

- کورەکە: نەخێر.

- ئەمجارە کچەکە بە پێکەنینێکەوە وتی: کەواتە لەلایەن پاراستنی دەوڵەتەوە لەژێر چاودێری دایە...

- کورەکە: نەخێر، بەڵکو لە لایەن خودای بیسەرەوە لەژێر چاودێری دایە...

هەر لەگەڵ ئەو وتەیە تەلەفونەکەی داخست و جارێکی تر پەیوەندی نەکردەوە...

## • وەڵامێکی بەهێزی عبدالباسطی قورئانخوێن

کەسێک بە عبدالباسطی قورئانخوێنی وت:

- مامۆستا تۆ قورئان بۆ کەسانێکیش دەخوێنی کە ئەسڵەن خۆیانی لێ کەڕدەکەن و گوێشت لێناگرن؟

- ئەویش وەڵامی دایەوە و وتی: کەڕ ئەگەر گوێی لە دەنگی هەورە تریشقەش نەبێ، بەڵام خۆ دلۆپە و تنۆکی باران دەبینێ!

## • بۆیاغچی و کابرای دەوڵەمەند

دەوڵەمەندێک لای بۆیاغچییەک پێڵاوەکانی بۆیاغ دەکرد.

- دەوڵەمەندەکە وتی: خەفەت مەخۆ برام منیش پێشان بۆیاغچی بووم.

- بۆیاغچییەکەش وتی: دڵتەنگ مەبە برام منیش پێشان دەوڵەمەند بووم.

## • بالول و پیاوە ناشیرینەکە

کابرایەک کە زۆر دزێو و ناشیرین دەبێ دەیەوێ گاڵتە بە بالول بکات و دەڵێت:

- بالول دەمەوێ شەیتان ببینم، لە کوێ دەتوانم بیبینم؟؟

- بالولیش بەخێرایی وەڵامی دایەوە و وتی:

- ئەگەر لە ماڵەوە ئاوێنەت نیە، ئەوا سەیری ئاوی ڕوون بکە دەیبینی.

## • وەڵامێکی شێخ شەعراوی

هەواڵیان بە شێخ شەعراوییدا و وتیان:

- چەند کەسێک لەئیسلام هەڵگەڕاونەتەوەو بوون بە مەسیحی!

ئەویش زۆر بە لەسەرخۆیی وتی:

- ئەوان بێ ئەقلەکانی ئێمە دەبەن بۆ خۆیان، ئێمەش ئەقلەکانی ئەوان بۆ خۆمان دەبەین.

## • یان ناوی خۆت بگۆڕە یان ژیانی من

ئەسکەندەری مەکدۆنی لە پیاوێکی شرۆڵەی هەژاری پرسی:

- ناوت چییە؟

کابرا وتی: " ئەسکەندەر".

ئەسکەندەر توورە بوو و وتی:

- چۆن دەبێت هەژارێکی وەکو تۆ ناوی منی لێبێت؟!!

هەژارەکەش وتی: قوربان، ئەگەر پێت ناخۆشە، یان ناوی خۆت بگۆڕە یان ژیانی من !!

## • وەڵامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێت) بۆ یەهوودییەک

یەهوودییەک پرسیاری لە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێت) کرد و وتی:

- ئەوە بۆچی لە دوای مردنی پێغەمبەرەکەتان نەتان توانی تەنانەت پازدەساڵیش خۆتان بگرن و دەستان کرد بەیەکتر کوشتن؟

- پێشەوا عەلیش وەڵامی دایەوە و وفەرمووی: خۆ ئێوە هێشتا قاچەکانتان وشک نەبووبوویەوە کاتێک بە موساتان وت: ﴿...يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞ ...﴾ [الأعراف: ١٣٨] واتە: ((...ئەی موسا خوایەکیش بۆ ئێمە ساز بکە وەکو ئەوانە چەند خوایەکیان هەیە!!...))

• ئەصمەعی و ئەبو جەعفەری مەنصور (صوت صفير البلبل)

لەسەردەمی ئەبو جەعفەری مەنصوردا هەر شاعیرێک شیعرێکی بردبا کە ئەبو جەعفەر گوێبیستی نەبووبێت ئەوا بە سەنگی شیعرەکەی زێڕ بە شاعیرەکە دەدرا جا شیعرەکەی لەسەر هەر شتێک نووسرابا، بەڵام نەگبەتی شاعیرانی ئەو سەردەمە لەوەدابوو کە خەلیفەی ئەبو جەعفەر زاکیرەیەکی زۆر بەهێزی هەبوو، هەر شیعرێکی بۆ وترابا بە جارێک لەبەری دەکرد، جا شاعیر هەبوو چەند ڕۆژێک شەونخونی بە دیار شیعرێک دەکرد، کاتێکیش دەچووە لای خەلیفە هیچ پارەیەکی پێنەدەدرا، چونکە ئەو دەیووت من ئەوشیعرەم بیستووە.

ئەصمەعی شاعیریش گوێبیستی ئەو هەواڵە بوو، بیستی کە شاعیران گرفتاری ئەبو جەعفەر بوونە، چونکە هەر شیعرێکی بۆ دەڵێن ئەو دەڵێت: جا ئەوە چییە من لەمێژە ئەو شیعرە دەزانم و دەمێکە گوێم لێبووە حەزدەکەی هەموویت بۆ دەڵێمەوە، (چونکە ئەبو جەعفەر یەکجار گوێبیستی شیعر بووبویایە لەبەری دەکرد، بۆیە هەر کە گوێی لە شاعیرەکە دەبوو ڕاستەوخۆ لەبەری دەکرد و بۆی دەووتەوە)، نەک تەنها هەر ئەوە، بەڵکو دەشیووت: من غولامێکم هەیە ئەویش ئەو شیعرە دەزانێ، ئەگەر حەزدەکەی با ئەویش بۆت بڵێتەوە (ئەو غولامەی بە دووجار شیعری لەبەر دەکرد، جارێک لە شاعیرەکە گوێی لێدەبوو، جاری دووەمیش لە ئەبو جەعفەر، بەمەش

شیعرەکەی لەبەر دەکرد و دەیووتەوە)، لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە من کەنیزەکێکیشم (جاریە) هەیە ئەویش ئەو شیعرە دەزانێت و لەبەریەتی (کەنیزەکەکەی بەسێ جار شیعرەکانی لەبەر دەکرد، جارێک لە شاعیر و جارێکیش لە ئەبو جەعفەر و جارێکیش لە غولامەکە گوێبیستی شیعرەکان دەبوو و لەبەری دەکرد...) ئەم کارە شاعیرانی گیرۆدە کردبوو، دوچاری نائومێدی بووبوون، چونکە نەیاندەزانی چۆن دیاری لە خەلیفە وەربگرن...جا کاتێک ئەصمەعی بەم فێڵەی زانی، وتی: بەڵێن بێت شیعرێک دابنێم کە نە خەلیفە و نە غولام و نە کەنیزەکەکەشی نەتوانن لەبەری بکەن، هەربۆیە شیعرێکی دانا بە ناوی (صوت صفیر البلبل) کە وشەکانی زۆر تێکەڵ لەیەکتریەوە نزیکن، کە هیچ کەسێک ناتوانێت بە ئاسانی لەبەری بکات...کاتێک شیعرەکەی تەواو کرد، چووە لای خەلیفە و پێی وت:

- جەنابی خەلیفە من شیعرێکم داناوە بڕواناکەم کە پێشتر گوێت لێبووبێت...

- خەلیفە: دەی دەشتەکی بزانم شیعرەکەت چییە...

ئەصمەعیش دەستی پێکرد و وتی:

صَوْتُ صَفِيْرِ البُلْبُلِ ... هَيَّجَ قَلْبِيَ الثَمِلِ

المَاءُ وَالزَّهْرُ مَعَاً ... مَعَ زَهْرِ لَحْظِ المُقَلِ

وَأَنْتَ يَاسَيِّدُ لِي ... وَسَيِّدِي وَمَوْلَى لِي

فَكَمْ فَكَمْ تَيَّمَنِي ... غُزَيِّلٌ عَقَيْقَلِي

قَطَّفْتُ مِنْ وَجْنَتِهِ ... مِنْ لَثْمِ وَرْدِ الخَجَلِ

فَقَالَ بَسْ بَسْبَسْتَنِي     فَلَمْ يَجِّدُ بالقُبَلِ
فَقَالَ لاَ لاَ لاَ لاَ لاَ     وَقَدْ غَدَا مُهْرُولِ
وَالخُودُ مَالَتْ طَرَبَاً     مِنْ فِعْلِ هذَا الرَّجُلِ
فَوَلْوَلَتْ وَوَلْوَلَتْ     وَلِي وَلِي يَاوَيْلَ لِي
فَقُلْتُ لا تُوَلْوِلِي     وَبَيِّنِي اللُؤْلُؤَلِي
لَمَّا رَأَتْهُ أَشْمَطَا     يُرِيدُ غَيْرَ القُبَلِ
وَبَعْدَهُ لاَيَكْتَفِي     إلاَّ بِطِيْبِ الوَصْلَ لِي
قَالَتْ لَهُ حِيْنَ كَذَا     انْهَضْ وَجِدْ بِالنَّقَلِ
وَفِتْيَةٍ سَقَوْنَنِي     قَهْوَةً كَالعَسَلَ لِي
شَمَمْتُها بِأَنْفِي     أَزْكَى مِنَ القَرَنْفُلِ
فِي وَسْطِ بُسْتَانٍ حُلِي     بِالزَّهرِ وَالسُرُورُ لِي
وَالعُودُ دَنْ دَنْدَنَ لِي     وَالطَّبْلُ طَبْ طَبَّلَ
وَالسَّقْفُ قَدْ سَقْسَقَ لِي     وَالرَّقْصُ قَدْ طَبْطَبَ
شَوَى شَوَى وَشَاهِشُ     عَلَى وَرَقْ سِفَرجَلِ
وَغَرَّدَ القِمْرِ يَصِيحُ     مِنْ مَلَلٍ فِي مَلَلِ
فَلَوْ تَرَانِي رَاكِباً     عَلَى حِمَارٍ أَهْزَلِ
يَمْشِي عَلَى ثَلاثَةٍ     كَمَشْيَةِ العَرَنْجِلِ
وَالنَّاسُ تَرْجِمْ جَمَلِي     فِي السُوقِ بالقُلْقُلُلِ
وَالكُلُّ كَعْكَعْ كَعِكَعْ     خَلْفِي وَمِنْ حُوَيْلَلِي
لكِنْ مَشَيتُ هارِبا     مِنْ خَشْيَةِ العَقَنْقِلِي

إلَــــى لِقَـــاءِ مَلِـــكٍ مُعَظَّــــمٍ مُبَجَّـــلِ
يَـــأْمُرُلي بِخَلْعَـــةٍ حَمْـــرَاءْ كَالـــدَّمْ دَمَلـــي
أجُـــرُّ فيهَـــا مَاشِـــياً مُبَغْـــدِداً للـــذَّيْلِ
أنَـــا الأدِيْـــبُ الألْمَعِـــي مِـــنْ حَـــيِّ أرْضِ المُوْصِـــلِ
نَظمْـــتُ قِطعـــاً زُخْرِفَـــتْ يَعْجِـــزُ عَنْهَـــا الأدْبُ لِـــي
أقُـــوْلُ فِـــي مَطْلَعِهَـــا صَـــوْتُ صَـــفيرِ البُلْبُـــلِ

کاتێک ئەصمەعی تەواو بوو خەلیفە چەند وشەیەکی پچڕ پچڕی وتن، کە هەر یەکەی لە دێرێک بوون...

دواتر بانگی غولامەکەیان کرد، ئەویش وتی:

– قەسەم بەخوا هەرگیز گوێم لەشتی وانەبووە...

– ئینجا جارییەکەیان بانگ کرد، ئەویش هەمان وتەی غولامەکەی وت...

– ئینجا خەلیفە وتی: ئەی دەشتەکی، ئەوەی نووسیوتە بیخە سەر هەر شتێکت کە تۆ دەتەوێ، دواتریش بە زێر سەنگی دەکەین و زێڕەکەشت پێت دەبەخشم...

– ئەصمەعی: بەڕێز جەنابی خەلیفە من تەواوی شیعرەکەم لەسەر پارچە ئاسنێک نەقش کردووە، کە بە چوار سەرباز نەبێت هەڵناگیرێ!!!

– خەلیفە کاتێ ئەمەی بیست شۆک بوو...بەڵام تازە بەڵێنی داوە خۆ پەشیمان نابێتەوە....

دەڵێن: کاتێک سەنگیان کرد بەرامبەر هەموو ئەو زێڕانە بوو کە لە خەزێنەی خەلیفەدا هەبوو، دواتر ئەصمەعی خستیە سەر پشتی وشترەکەی و ڕۆیشت...

دواتر وەزیرەکەی خەلیفە وتی: ئەی خەلیفە ڕاییگرە، والله من گومان دەبەم کە ئەمە ئەصمەعی بێت، ئەویش فەرمانی کرد و ڕایان گرت، وتیان: ئەو دەمامکەت لابدە، کاتێک لایدا بینیان کە ئەصمەعیە، وتیان:

- ئەو کارە لەگەڵ ئەمیری باوەڕداندا دەکەین ئەی ئەصمەعی؟؟

- ئەویش وەڵامی دایەوە و وتی: بەڵێ، چونکە تۆ بە زاکیرە بەهێزەکەت قوتی شاعیرانت بڕیبوو...

- ئینجا خەلیفە پێی وت: ئەو زێڕە بۆ خەزێنە بگێڕەوە...

- ئەویش وتی: نایگێڕمەوە...

خەلیفە: بیگێڕەوە ئەی ئەصمەعی...

- ئەصمەعی: باشە، بەس بەیەک مەرج، قوت و دیاری بۆ شاعیران بگێڕیتەوە و چیتر ئەو کارەیان بەرامبەر نەکەیت....

- خەلیفەش بەمە ڕازی بوو.....

- **ئاگاداری وتەکانت بە**

ڕۆژێک سوفیانی سەوری (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) بەهاوەڵەکانی خۆی وت :

- ئەگەر کەسێک لەو دانیشتنەمان بێت و قسەکانمان بۆ دسەڵاتدار بگێڕێتەوە، ئایا قسەیەک دەکەن کە مایەی نیگەرانی دەسەڵاتداربێت؟

- وتیان نەخێر ، ئینجا سوفیان وتی:
- کەوایە ئاگاداربن لە مەجلیس و دانیشتنەکانمان فریشتە هەن و قسەکانمان بۆلای خودا دەبەنەوە، بۆیە قسەیەک مەکەن ببێتە مایەی تووڕەبونی پەروەردگار.

## • بەیانیتان باش

ئافرەتێک چوار گوێدرێژی هەبوون، ڕۆژێکیان ویستی بیان فرۆشتێت، بۆیە بردنی بۆ بازاڕ...
لە سوچێکەوە وەستابوو چاوەڕێی کڕیارێی دەکرد کە بێت گوێدرێژەکانی لێبکرێت...
لەو کاتەدا دوو گەنج بەوێدا تێپەڕ دەبن، کاتێک ئافرەتەکە دەبینن پێی پێدەکەنن و دەیانەوێ سوکایەتی پێبکەن، بۆیە دەڵێن:
- بەیانیت باش دایکی گوێدرێژەکان...
ئەویش هیچ خۆی تێک نادات و وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێ:
- بەیانی ئێوەش باش کوڕەکانم!!

## • بۆ نەخۆشیت؟

پیاوێک بە گاڵتەوە بە پزیشکێکی وت:
- پێدەچیت دکتۆری ئاژەڵان بیت ؟
پزیشکەکەش خۆی تێک نەدا و بەسەر خۆی نەهێناو وتی:
- بەڵێ ، بۆ پرسیت؟ نەخۆشیت ؟

## • ئەوەی زۆر بژی پیریش دەبێت

پیاوێکی بەتەمەنی پشت کووڕ بوو بەڕێگادا دەڕۆیشت، بەلای گەنجێکدا ڕەت بوو، گەنجەکە بە گاڵتەپێکردنێکەوە بە پیرە پیاوەکەی وت:

- مامە ئەو گۆچانەت نافرۆشی؟؟ (مەبەستی پشتی بوو، کە وەک گۆچان قەوسی لێهاتبوو).

پیرەمێرەدەکەش زۆر بەهێمنی ئاوڕێکی بەلادا دایەوە و پێی وت:

- پەلە مەکە کوڕەکەم، ڕۆژێک دادێت بەخۆرایی پێت دەدەن!!

## • لە پشت هەموو پیاوێکی سەرکەوتوو، ژنێکی سەرکەوتوو هەیە

ئێوارەیەک ئۆباما بڕیاریدا لەگەڵ میشێلی هاوسەری لە چێشتخانەیەکی گەورە نان بخۆن بۆ ئەوەی کەمێک لە جەنجاڵی سیاسەت دووربکەونەوە .

کاتێک چوونە چێشتخانەکە خاوەنی چێشتخانەکە داوای لە پاسەوانی تایبەتی ئۆباما کرد کە ئەیەوێ بە تەنیا چاوی بە مێشێل بکەوێت.

- ئۆباما ڕێگەی پێدا بەیەکەوە قسە بکەن، کاتێک میشێل گەڕایەوە، ئۆباما لێی پرسی: بۆچی ویستی بەتەنیا قسەبکەن، ئەوە کێ بوو؟

- میشێل وتی: کاتێک لە زانکۆ بووم ئەو خۆشی ئەویستم، ئێستا خۆشەویستی خۆی بۆ دووپاتکردمەوە.

- ئۆباما بەپێکەنینەوە وتی:

- ئەگەر هاوسەرگیریت لەگەڵ ئەودا بکردبایە ئێستا خاوەنی ئەم چێشتخانە گەورەیە دەبوویت.
میشێلیش بەوپەڕی باوەڕ بەخۆبوونەوە بە ئۆبامای وت:
- نەخێر، ئەگەر هاوسەرگیریم لەگەڵ ئەودا بکردبایە، ئەوا دەمکرد بە سەرۆکی ئەمریکا .

## • چی بەلای تۆوە گرنگە؟

بە ئەبو سەعید ئەبولخەیریان وت:
- فلان کەس دەتوانێ بفڕێت!
- وتی: خۆ ئەوە گرنگ نیە، مێشوولەش دەفڕێ!
- وتیان: بۆ فلانە کەس دەڵێی چی ؟ بەسەر ئاودا دەڕوات!
- وتی: هیچ گرنگ نیە، پارچە دارێکیش هەمان کار دەکات (سەر ئاو دەکەوێت)!
- وتیان: ئەدی بەلای تۆوە شاکار چیە؟ (چی زۆر گرنگە؟)
- وتی: ئەوەی کە لەناو خەڵک دا ژیان بەسەر ببەی بەڵام هیچ کات بە زمانت کەسێک بریندار نەکەی، درۆ نەکەی، فێڵ نەکەی، دڵێک نەشکێنی، لە متمانەی کەس کەڵکی خراپ وەرنەگری، وە کەس لەخۆت نەڕەنجێنی.

## • تۆ چۆنی؟

لە مالیکی کوڕی دیناریان پرسی چۆنی؟
وتی: دەبێ چۆنبێ ئەوکەسەی تەمەنی کورتە و گوناهی زۆرە؟
لەمحمدی کوڕی واسعیان پرسی تۆچۆنی؟

وتی: دەبێ چۆنبێ ئەوکەسەی کهەر ڕۆژەو هەنگاوێ لەدوارۆژ نزیک بێتەوە؟

زانایەک لەوەلامی ئەوەی لێیان پرسی چۆنی؟

وتی: لەسەرخوانی خوادەژیم و گوێ ڕاڵەی شەیتانم!

بەحامیدی لەففیان وت: تۆ چۆنی؟

وتی: تامەزرۆی ڕۆژێ سەلامەتیم.

وتیان نەخۆشی؟

وتی: ئەو ڕۆژە سەلامەتم کە بە بێ تاوان ئەو ڕۆژە بە ڕێ بکەم.

لەیەکێکیان پرسی - کە لەسەرە مەرگ دابوو- : تۆچۆنی؟

وتی: دەبێ چونبێ حاڵی ئەو کەسەی بەبێ توێشوو لەسەفەرێکی دوورو درێژدایە، بەبێ هاودەم لەگۆڕێکی تەنگ دابێ.

بەحەسانی کوڕی سەنانیان وت: چۆنی؟

وتی: چۆنە ئەوکەسەی دەمرێ و بۆ لێپرسینەوە هەڵیدەستێنەوە؟

گەر لە من بپرسی!

دەڵێم: هەژار و دەوڵەمەند، گەنج و پیر، بێ دین و باوەڕدار، ئافرەت و پیاو، ئەوەی مرد لە بیر دەکرێت. ئینجا دەبێ حاڵمان چۆنبێ لە-ڕۆژی دوایی- کە حەق و حیساب دێتە ئارا؟

گەر لەتۆ بپرسن وەلامت چیە؟

- **وتەکەت پێچەوانە بکەرەوە**

پیاوێک گوێی لە پیاوێکی تر بوو دەیووت:

- کوان ئەوانەی وازیان لە دونیا هێناوە و ئارەزووی دوارۆژدەکەن و کاری بۆ دەکەن؟
پیاوەکەش وتی:
وتەکەت پێچەوانەوە بکەوە، پاشان کێت ویست دەستی لەسەر دابنێ.

- **خودای گەورە چۆن بەجارێک لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرەی خەڵکیدا دەکات؟؟**

لە پێشەوا عەلی (خوا لێی ڕازی بێت)یان پرسی:
- خودای گەورە چۆن بەجارێک لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرەی خەڵکیدا دەکات؟
پێشەوا عەلیش فەرمووی:
- هەروەک چۆن بەجارێک ڕزق و ڕۆزیان دەدات.

- **منم!**

پیاوێک لە دەرگای ماڵی عەمڕی کوڕی عوبەیدی دا، ئەویش وتی:
- ئەوە کێیە؟
- پیاوەکە: منم!!
- عەمڕ: بمبورە هیچ لە دۆستەکانم ناوی (منم) نیە!!

- **ئێوە چۆن ژیاون؟**

گەنجێک بە گاڵتەپێکردنێکەوە بە باپیرەی وت:

- باشە باپیرە ئێوە پێشان چۆن ژیاون، لەکاتێکدا کە لەسەردەمی ئێوەدا نە ئینتەرنێت، نە کۆمپیوتەر، نە فرۆکە...هیچیان نەبوون؟!
باپیرەش زۆر لەسەرخۆ و بەهێمنی وەڵامی دایەوە و وتی:
- هەروەک ئێوە ڕۆڵەکەم،
وا ئێوەش لەو سەردەمەدا بەبێ نوێژ و عیبادەت و پەروەردە و ئەدەب ڕەوشت ...دەژین!

## • وەڵامێکی ژیرانە

پادشایەک لە یەکێک لە وەزیرەکانی توڕە دەبێت و فەرمانی دەست بەسەرداگرتنی بۆ دەردەکات، هەروەها ڕاشیدەگەیەنێت کە تاوەکو ئەسپێکی بۆ نەیەنێ ئازاد ناکرێت، بەمەرجێ ئەسپەکە نە خۆڵەمێشی نە ڕەش نە سور نە سپی....بێت، واتە هەموو ئەو ڕەنگانەی وتن کە ئەگەری هەبوونی ئەسپی لەو ڕەنگە هەبێت.
وەزیر بەم بڕیارەی پادشا ڕازی بوو، بەڵێنی پێدا کە ئەگەر ئازادی بکات ئەسپێکی لەو جۆرەی بۆ پەیدا دەکات.
وەزیر ئازاد دەکرێت، چەند ڕۆژێک دوای ئازاد کردنەکەی کەسێک دەنێرێتە لای پادشا تاوەکو پێی بڵێت پادشا وەزیر ئەسپەکەی پەیدا کردووە و چاوەڕێی نێردراوی جەنابتان دەکات تاوەکو ئەسپەکەی پێبدات، بەڵام مەرجێکی هەیە ئەو کەسەی کە ئێوە بۆ لای وەزیری دەنێرن نابێت لە ڕۆژی شەممە و یەک شەممە و دووشەممە و سێ شەممە و چوارشەممە و پێنج شەممە و هەینیدا بچێت، جگە لەم

ڕۆژانە گەورەم هەر ڕۆژێک نێردراوەکەی بنێرێت ئێمە ئەسپەکە دەنێرینە خزمەتی جەنابیان.

- **هەرچی تۆ دەیڵێی ڕاست نیە!!**

شای ڕۆم بۆ شای فارسی نووسیبوو:

- هەرچی تۆ دەیڵێی ڕاست نیە و درۆیە!!

ئەویش لە وەڵامیدا نووسیبووی:

- ڕاست دەکەیت (واتە ئەو قسەی تۆش کردت درۆیە).

- **کامیان بۆ پادشا گرنگترن؟**

ئەسکەندەری مەکدۆنی پرسیاری لە ئەرستۆ کرد:

- بۆ پادشا کامیان گرنگترن: ئازایەتی یاخود دادپەروەری؟

- ئەرستۆ وتی: ئەگەر دەسەڵاتدار دادپەروەر بێت، پێویستی بە ئازایەتی نابێت.

بەڕاستی ئێمەش باش خودامان نەناسیوە!

- **ڕۆژێک عاشقێک بەبەردەم پیاوێکدا تێپەری کە نوێژی دەکرد....**

پیاوەکە نوێژەکەی بڕی و بە توڕەییەوە وتی:

- هۆی شێتە من خەریکی ڕازو نیازم لەگەڵ خوای خۆم تۆ بۆبەبەردامدا دەڕۆیت و نوێژەکەم لێ تێک ئەدەیت و لە دایداری پەروەردگارم دام دەپچڕێنی؟

- عاشقەکە بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە و وتی:

- سەیرە من لەبەر عاشق بوونم بە بەندەیەکی سادەی پەروەردگار چوومەتە دونیایەکی تر و ئاگام لە هیچ بەندەیەکی تر نەماوە، هەربۆیەش تۆم نەبینی، بەڵام تۆ گەر بەراستی موشتاقی دیدار و لیقای پەروەردگارتی، ڕاستگۆیانە لەگەڵی دەدوێی چۆن لەگەرمەی ڕازو نیازدا منت ببینی و گفتوگۆت بچڕاند!!

## • بەهەشت پێغەمبەری خودای لێیە

لە قەعقاعی ئەوسیان پرسی:

- شتێکمان دەربارەی بەهەشت پێ بڵێ بۆ ئەوەی زیاتر شەیدای بین!!

ئەویش وتی :

- بەهەشت پێغەمبەری خوای لێیە!

## • وەڵامی ئەنسارییەک بۆ موعاویە

ڕۆژێکیان موعاویە لە نێو کۆمەڵە کەسێکدا دەستی کرد بە قسەکردن و وتی:

ئەی کۆمەڵەی خەڵکی، خودای گەورە قوڕەیشی بەسێ شت خۆشویستووە و شەرفەمەندی کردوون، یەکەم: بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمووو: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ [الشعراء: ٢١٤] ئێمەش

هەروەها فەرموویەتی: (ﷺ) کەسانی نزیکی پێغەمبەرین ﴿ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ... ﴾ [الزخرف: ٤٤] ئێمەش قەومی ئەوین، هەروەها پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ ﴾ [قریش: ١] ئێمەش قورەیشین.

پیاوێکیش لە ئەنسارییەکان هەستایەوە و وەڵامی موعاویەی دایەوە و وتی:

- خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوْمُكَ وَهُوَ ٱلْحَقُّ ... ﴾ [الأنعام: ٦٦] ئێوەش قەومی ئەون، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴾ [الزخرف: ٥٧] ئێوەش قەومی ئەون، هەروەها لە ڕۆژی دوایی پێغەمبەری سکاڵا لای پەروەردگاری دەکات و دەفەرمووێت: ﴿ ...يَٰرَبِّ إِنَّ قَوْمِى ٱتَّخَذُوا۟ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ مَهْجُورًا ﴾ [الفرقان: ٣٠ ] ئێوەش قەومی ئەون!!

## • بمرن لە داخان

ڕۆژێکیان حەجاج دەیویست بچێتە سەر مینبەرەکەی بۆ ئەوەی دەست بە وتارەکەی بکات، بەڵام بەرلەوەی بگاتە جیگای خۆی بینی لەسەر مینبەرەکەی نووسراوە: ﴿ ...تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴾ [الزمر: ٨].

ئەویش هیچ خۆی تێک نەدا و لە ژێر ئەو ئایەتە نووسی:

﴿....مُوتُوا۟ بِغَيْظِكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ [آل عمران: ١١٩].

## • بەڵگەت لەسەر بوونی خودا چییە؟

پیاوێک هاتە لای جەعفەری صادق و لێی پرسی:

- بەڵگەت لەسەر بوونی خودا چییە؟ بەڵام تکایە باسی چۆنیەتی دروست بوونی جیهان و چۆنیەتی خەلق و مخلوقاتم بۆ مەکە؟

- جەعفەری صادق وتی: ئایا قەت سواری کەشتی بوویت؟

- پیاوەکە بەڵێ بەدڵنیاییەوە زۆرجاران سواربووم و گەشتم پێی کردووە.

- جەعفەری صادق: ئایا لەو گەشتانەتدا وا ڕوویداوە کە بایەکی توند هەڵبکات و مەترسی خنکانتان لا دروست ببێت؟

- پیاوەکە: بەڵێ.

- جەعفەری صادق: ئایا گەیشتیتە ئەو ڕادەیەی کە لە بەهاناهاتنی کەشتیوان و مەلەوانەکان بێ هیوا بیت؟

- پیاوەکە: بەڵێ، جارێک وام بەسەرهات، ئەوان هەموویان لە خەمی خۆیاندا بوون.

- جەعفەری صادق: ئایا پێت وابوو کە یەکێک بەهاناتەوە دێت و ڕزگارت دەکات؟

- پیاوەکە: بەڵێ.

- جەعفەری صادق: سا ئەوە خودایە...

پەروەردگاری مەزن دەفەرموویت: ﴿ وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ كَفُورًا ﴾ [الإسراء: ٦٧ ]﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ ﴾ [النحل: ٥٣ ].

### • کەس باری تاوانی کەس هەڵناگریّ

حەجاجی کوڕی یوسف پیاوێکی دەستگیر کردبوو کە براکەی تاوانێکی ئەنجام دابوو، حەجاج بە پیاوەکەی وت:

- قەسەم بەخوا ئەگەر براکەت، یاخود وەڵامێکم بۆ لە ئەمیری باوەڕدارانەوە نەهێنی دەتکوژم.

پیاوەکەش زۆر بەخێرایی وەڵامی دایەوە و وتی:

- من وەڵامێکت بۆ لە لایەن پەروەردگاری ئەمیری باوەڕدارانەوە بۆ دەهێنم، کە دەفەرموویت:﴿ ...وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ... ﴾ [الأنعام: ١٦٤] واتە: ((کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت، کەس بەرپرسیار نیە لە هەڵەی کەسانی تر)).

حەجاج بێ دەنگ بوو و فەرمانی ئازادکردنی پیاوەکەی دا...

### • چەند لە جەستەم بەدەربخەم؟؟

کچێک لە باوکی دەپرسێت:

- باوکە چەند لەجەستەم داپۆشم و چەندی بە دەربخەم؟

باوکە وەڵامی دایەوە و وتی:

- ئەوەندی لێ بەدەربخە کە بتوانی بەرگەی سوتانی بگری لە ئاگری دۆزەخدا.

## • پێگە و ماڵی من بەرزترە لە هی پەروەردگار؟؟

هاتن بۆ مزگەوت و دوای نوێژ لە مزگەوت هاتنە دەرەوە، پیاوێکی دانا هاتە سەر ڕێگای و سڵاوێکی گەرمی لێکرد، پاشان پێی وت:

- ئەی گەنجی بەڕێز فەرموو بابچینە ماڵی ئێمە و کەمێک دابنیشین و شتێک بەیەکەوە بخۆین...

بەڵام گەنجەکە بیجامەیەکی لەبەربوو بۆیە بەشەرمەوە وتی:

- بمبورە بەڕێزم، بەو جلانە ناتوانم بێم بۆ ماڵەکەتان، چونکە خۆت دەبینی پۆشاکەکانم گونجاو نیین!!

- پیاوەکە زۆر بە دانایی وتی: پێگە و ماڵی من لە هی خودا بەرزتر و پیرۆزتر دەزانی؟

کوڕەکە ڕەنگی سورهەڵگەڕا و سەری داخست، پاشان وتی:

- پەیامەکەت گەیشت....﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ﴾ [الأعراف: ٣١].

## • الکموج چییە؟

پیاوێک پرسیاری لە پێشەوا ئیشبیلی کرد، الکموج چییە؟

کە مەبەست پێی کموج بوو (ک+موج) کە لەو دێرەی أمرئ القیس دا هاتوو و دەڵێت: (ولیل کموج البحر) (١)
ئەویش وتی: الکموج: گیانداریێکە دەخوێنێتەوە و تێناگات.

- **کامیان جوانترە، دایکم یان مانگ؟؟**

شێخ موحەممەد حسان، گەورە بانگخوازی میسری دەڵێ:
- لێیان پرسیم دایکت جوانترە یاخود مانگ؟
دەڵێ منیش پێم وتن:
- هەر کاتێک سەیری دایکم دەکەم مانگم بیر دەچێتەوە...
هەر کاتێکیش سەیری مانگ بکەم دایکم بیر دێتەوە...

- **لەسەر زمانی گیاندارانەوە**

کەڵەبابێک بە مریشکێک دەڵێ:
- ئەرێ خاتوون تۆ لەوەتەی هەی هێلکە دەکەیت، بەڵام جارێک هێلکە و ڕۆنێکت نەخوارد...
مریشکیش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: - بەخوا تۆش لەوەتەی هەیت بانگ دەدەیت، بەڵام جارێک دوو ڕکاعەت نوێژت نەکرد..

- **ئێمە لە کوێ بوین؟**

دوو برادەر بەیەکەوە قسەیان دەکرد، یەکێکیان بەوەی تری وت:

---

(١) وَلَيْلٍ كَمَوْجِ البَحْرِ أَرْخَى سُدُوْلَهُ... عَلَيَّ بِأَنْوَاعِ الهُمُوْمِ لِيَبْتَلِي

- باشە ئێمە لە کوێ بوین کاتێک خودای گەورە ئەو هەموو پارە و کۆشک و تەلارەی دابەش دەکرد؟

برادەکەشی هیچی نەوت، دەستی گرت و بردی بۆ نەخۆشخانەیەک، پاشان پێی وت:

- ئەی ئێمە لە کوێ بووین کاتێک ئەو هەموو دەرد و بەڵا و نەخۆشییە دابەشکرا؟

## • ئایا ئەوان هەر بە ڕاست ئازادی ئافرەتیان دەوێت؟

لە زانایەکیان پرسی:

- ئەو پیاوانەی داوای ماف و حەقی ئافرەتان دەکەن، هەر بەڕاست ئەوان ئازادیان بۆ ئافرەت دەوێ؟؟

ئەویش وتی:

- نەخێر، بەڵکو ئەوان ئازادی گەیشتن بە ئافرەتیان دەوێ!!

## • وەڵامێکی شێخ عورەیفی

لای شێخ عورەیفی وتیان:

- شیعەکان دەڵێن: ئێمە لە مزگەوتی پێغەمبەر لەو دەرگایە ناچینە ژوورەوە کە عومەری کوڕی خەتاب پێیدا چووتە ژوورەوە.

شێخ عورەیفیش وتی:

- ڕەحمەتی خودا لە پێشەوا عومەر بێت، کە شەیتانەکان بە زیندوویی و بە مردوویی لێی ڕادەکەن.

• کەس لەو گەورەتر نیە!!

گەنجێکی موسڵمان و سەرکردەیەکی ئەڵمانی

لەسەر ڕووی یەکێک لە کەشتیە گەورەکان گەنجێک دانیشتبوو، ئامێرێکی موبایلیشی لەدەست بوو کە دەیویست لە ڕێگەیەوە بەخشی ڕاستەوخۆی مەککەی پیرۆز بدۆزێتەوە، پیاوێکی بەتەمەنیشی لەتەنیشتەوە دانیشتبوو، سەیری پیاوەکەی کرد و زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و دواتریش بەردەوام بوو لە گەڕانەکەی، دوای ئەوەی پەخشی مەککەی پیرۆزی دۆزیەوە زەردەخەنەیەکی تری کرد و بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە سەیری شاشەکەی دەکرد، چاوەکانی پڕبووبوون لە فرمێسک..کاتێک پیاوە بەتەمەنەکە ئەو ڕەفتارانەی لەو گەنجە بینی هەوڵیدا هۆکاری ئەو پێکەنین و گریانانەی چییە، کەمێک چووە نزیکیەوە و پرسی: ئەمە چ شتێکە تۆ دەخاتە پێکەنین و گریانەوە؟

گەنجەکە: خۆشەویستی و تامەزرۆیم بۆیان!

پیاوەکە: تامەزرۆیی کێ، ئەوان کێن؟؟

میوانانی ماڵی خودا!!

پیاوەکە لەمەبەستی تێنەگەیشت!! وتی: دەزانی من کێم؟

گەنجەکە: نەخێر.

- پیاوێکە وتی: من سەرکردەی هێزی دەریایی ئەڵمانیام.
- گەنجەکە: خۆشحاڵم.

- پیاوەکە وتی : من لە پێغەمبەرەکەشت گەورەترم!!!
- گەنجەکە: پێغەمبەری من کێیە؟ دەیناسیت؟
- وتی: بەڵێ دەیناسم. تۆ موسلمانیت و باوەڕت بە محمد هەیە...
- گەنجەکە وتی: بەڵی، بەڵام چی وای لە تۆ کرد کەبڵێی من لەو گەورەترم؟!!
- پیاوەکە وتی: من دەتوانم هێزیکی ۲۰ هەزار کەسی لەماوەی کەمتر لە ۱۰ خولەکدا ڕێکبخەم!
- گەنجەکە وتی: ئەی ئەگەر ۲ ملیۆن کەس بن ئەوا چەند کاتت دەوێ بۆ ئەوەی ڕێکیان بخەیت؟
- پیاوەکە وتی: ئەگەر پێشتر خۆم ڕاهێنانم پێکردبن دڵنیابە کە ۲ کاتژمێر زیاتر نابات...
- گەنجەکە وتی: ئەی ئەگەر زمانیان جیاواز بێت تەمەنیان جیاواز بێت لە هەموو وڵاتە جیاوازەکانی جیهان بن چۆن ڕێکیان دەخەیت؟
- پیاوەکە بەگاڵتەجارییەوە وتی: مەحاڵە بەهیچ شێوەیەک ڕێکناخرێن!
- گەنجەکە وتی: دەکەواتە فەرموو سەیری قیبلەکەی ئێمە بکە، سەیری ماڵی خوای ئێمە بکە، سەیری میوانانی ماڵی خوا بکە، کە لە هەموو وڵاتانی جیهانەوە هاتوون، بە دەنگی یەک پێش نوێژ خوێن کاتێک دەڵێ: ڕێک بوەستن، نزیکەی زیاتر لە ۲ ملیۆن کەس ڕێکدەوەستن بە بێ سەرۆک بەبێ چاودێر وە بەبێ یاسا!

- گەنجەکە پێی وت: ئەمە دینی ئێمەیە، ڕێبازی ئەو پێغەمبەرەمانە کە تۆ گاڵتەی پێدەکەیت! ئەو مردووە بەڵام فەرمایشتەکانی تاکو ئێستا ماون و هەر دەمێنێ...بۆیە کەس لەو گەورەتر نیە.

- **وەڵامێکی بەهێزی شێخ دیدات**

ڕۆژێک یەهوودییەک پرسیار لە( ئەحمەد دیدات )دەکات:

-هەستت چۆن ئەبێت ئەگەر مردیت و بۆت دەرکەوت قیامەت درۆیە؟!

شێخیش وتی: خراپتر نابێت لە هەستی تۆ کاتێک دەمریت و بۆت دەرەکەوێ کە قیامەت ڕاستە!

- **ئێوە دینەکەتان فرۆشت و ئێمەش لێمان کرین!**

ئافرەتیکی موسڵمانی باڵاپۆش بەمەبەستی شت کرین چووە سوپەرمارکێتێک لە فەرەنسا، دوای ئەوەی تەواوی پێداویستیەکانی هەڵگرت و تەواو بوو، چوو بۆ لای مێزی کاشێر تاوەکو پارەی کاڵاکانی بدات.

ئافرەتێکی سفوری بە ڕەگەز عەرەب لەپشت مێزەکەوە دانیشتبوو، سفورەکە بە چاوێکی سوکەوە سەیرێکی موسڵمانەکەی کردو شتەکانی بۆ حساب دەکرد و بەتوندی شتەکانی ئەدایەوە بەسەر مێزەکەدا!

بەڵام موسلمانەکە هیچ تورە نەبوو زۆر لەسەرخۆ بوو، ئەمەش زیاتر کچەکەی تورە کرد.
پاشان چیتر نەیتوانی دان بەخۆیدا بگرێت و سوکایەتیەکەوە بە موسلمانەکەی وت :
-ئێمە لە فەرەنسا چەندەها کێشەمان هەیە و یەکێک لەو کێشانەش پەچەکەی تۆیە، ئێمە بۆ بازرگانی هاتوین بۆ فەرەنسا نەک بۆ دەرخستن و عەرزکردنی ئاین و مێژوو، ئەگەر دەتەوێت دینەکەت جێ بەجێ بکەیت و پەچە بپۆشیت ئەوە بچۆرەوە بۆ وڵات و نیشتمانی خۆت ئەو کارە بکە.
موسلمانەکە وەستا و سەیریکی کچەکەی کرد و بەهێمنی پەچەکەی لادا، ئافرەتێکی سور و سپی و چاو کاڵ بوو، پاشان بە کچە سفورەکەی وت :
-بەرێزم من فەرەنسیم و باوک و باپیرم فەرەنسی بوون! ئیسلام ئاینمە و ئەمەش وڵات و نیشتمانی خۆمە، ئێوە دینەکەتان فرۆشت و ئێمەش لێمان کرین!

## • مەرجی کچێک بۆ هاوسەرگیری

کچێکی جوان هەبوو... دەیویست شو بکات، بەڵام بە کەسێکی دیندار و پابەند بە پەرستشەکان، هەمیشە دەی وت: من هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێک دەکەم کە لە رۆژێکدا هەموو قورئان بخوێنێتەوە و، تەواوی ساڵ بە رۆژوو بێت، هەموو شەوێکیش شەونوێژ بکات!

ئەو کچێکی زۆر جوان بوو، هەر بۆیەش گەنجانێکی زۆر دەیانوویست هاوسەرگیری لەگەڵ بکەن، بەڵام کاتێک دەیانزانی کە ناتوانن داخوازییەکانی جێبەجێ بکەن، چونکە مەرجەکانی قورس بوو، بەڵام ڕۆژێکیان گەنجێک هاتوو وتی: من دەتوانم داخوازییەکانت جێبەجێ بکەم. هەر بۆیەش زۆر بەخێرایی هاوسەرگیرییەکەیان بەسترا و بوون بە هاوسەری یەکتر.

دوای ماوەیەک لە گواستنەوە، ژنەکە بینی کە ئەو پیاوە لە ڕۆژێکدا هەموو قورئان ناخوێنێتەوە، هەموو ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نابێت، هەروەها هیچ شەوێکیش شەو نوێژ ناکات!! بۆیە بڕیاری دا تا چەند هەفتەیەک چاوەڕێ بکات تا بزانێت هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەردا دێت. بەڵام هیچ گۆڕانکاریەکی نەبینی، بۆیە بڕیاری دا سکاڵا تۆمار بکات بۆ ئەوەی لێی جیابێتەوە...

ڕۆژی دادگایی دیاریکرا...هەردووکیان لەبەردەم دادوەر وەستان، دادوەر پرسیاری لێکردن:

- "مەرجی هاوسەرگیریەکەتان چیە؟"

- پیاوەکە وەڵامی دایەوەو وتی "ئەبێت تەواوی قورئان بخوێنمەوە، تەواویساڵیش بەڕۆژوو بم، شەوانیش بەخەبەربم و عیبادەتی خوا بکەم.

- دادوەرەکە پرسیاری کرد" ئایا هەموویت ئەنجام داوە؟"

- پیاوەکە بەهێمنی وەڵامی دایەوە وتی "بەڵێ"

- دادوەرەکە وتی تۆ درۆ دەکەیت، ژنەکەت دەڵێت تۆ ئەو کارانە ناکەیت. هەر لەبەر ئەمەشە داوای جیابوونەوە دەکات.
بەڵام پیاوەکە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە مەرجەکانی بەجێهێناوە.
- ئەمجارەش دادوەرەکە پرسیاری کرد: ئایا هەموو قورئان دەخوێنیتەوە لە ڕۆژێکدا؟
- پیاوەکە وەڵامی دایەوە "بەڵێ" .
-دادوەرەکە سەری سوڕماو وتی چۆن؟ چۆن ئەوکارە دەکەیت؟
- پیاوەکە زۆر بەهێمنی وتی " سورەتی (الاخلاص) سێ جار دەخوێنمەوە لەڕۆژێکدا... پێغەمبەری خوداش (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەر کەسێک ڕۆژی سێ جارە سورەتی (الإخلاص) بخوێنێت، وەکو ئەوە وایە کە تەواوی قورئانی خوێندبێت))...
دواتر دادوەرەکە بەردەوام بوو و پرسی: ئەی چۆن هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو بویت؟"
- پیاوەکە وەڵامی دایەوە:" تەواو مانگی ڕەمەزان بەرۆژوو بووم، (٦) ڕۆژیش لەمانگی شەوال، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەسێک مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت لەگەڵ شەش ڕۆژ لەمانگی شەوال، وەکو ئەوە وایە کە تەواوی ساڵەکە بەڕۆژوو بووبێت)).
دادوەرەکە بێدەنگ بوو نەیدەتوانی وەڵامێک بداتەوە کە بڵێت پیاوەکە هەڵەیە... بەڵام دواتر هەر چۆنێک بوو بەردەوام بووە تاوەکو پرسیاری سێیەمیشی لێبکات وتی:

- "ئەی چۆن بەدرێژایی شەو ناخەویت و هەر شەو نوێژ دەکەیت، لەکاتێکدا کە هاوسەرەکەت دەڵێ تا نوێژی بەیانی دەخەوێ؟"
دادوەرەکە پێی وابوو کەناتوانێت وەڵامی ئەمە بداتەوە...
بەڵام وەک هەمیشە پیاوەکە زۆر بەهێمنی وەڵامی دایەوەو وتی
- نوێژی عیشا و بەیانی بەجەماعەت ئەنجام دەدەم ، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەسێک نوێژی عیشا و نوێژی بەیانی بەجەماعەت ئەنجام بدات ئەوە وەکو ئەوە وایە کە تەواوی شەوەکە شەو نوێژ و یادی خوای کردبێت)).
- دادوەرەکە هیچ قسەیەکی نەما و دانیشت و سەیری پیاوەکەی دەکرد: بڕیاری کۆتایی: بڕیاردرا... فڵانی کوڕی فلان ئازادە و مەرجەکانی هاوسەرگیرییەکەی هێناوەتە دی و بە هیچ شتێک تاوانبار نیە، بە ژنەکەشی وت: بەڕاستی ئەوکەسەت هەڵبژاردووە کەخۆت ویستووتە.

## • شەقام موڵکی گشتیە

سەگێک لەسەر شەقامێکی گشتی لە نێوان دوو ماڵدا پیسایی دەکات، خاوەنی دوو ماڵەکەش لەسەر پاککردنەوەی دەبێتە کێشەیان، بۆیە دەچنە لای قازی و کێشەکەی خۆیانی لا باس دەکەن، لەو کاتەدا بالولیش لەوێ دەبێ، قازی وەک گاڵتەکردنێک بە بالول دەڵێت:
- بالول لە کاری پیسایی و سەگدا زیرەکە، با ئەو ئەم کارە یەکلایی بکاتەوە.

- بالولیش دەڵێت: جا ئەوە ڕوونە، هیچی شاراوەی تێدا نیە، سەگەکە لەسەر شەقامی گشتی پیسایی کردووە، کەواتە لەسەر هیچ کامتان نیە کە پیساییەکە پاک بکەنەوە، بەڵکو ئەوە واجبی قازییە و دەبێت ئەو پاکی بکاتەوە!! ...قازی بێدەنگ بوو و سورهەڵگەڕا.

### • پەیامێک بۆ هەمووان؟؟!

باوکێک مۆبایلەکەی برد بۆ لای وەستای مۆبایل...

پاش ماوەیەک وەستاکە مۆبایلەکەی بۆ ناردەوە و پێی وت:

- مامە گیان مۆبایلەکەت هیچ عەیبی نیە بۆچی هێناوتە؟؟

- باوکەکە بە دەنگێکی لەرزۆک و غەمگین وتی: بەراست؟؟

ئەی بۆچی هیچ یەکێک لە منداڵەکانم پەیوەندیم پێوە ناکەن؟؟

### • ئێستا نەشوان شوانە و نەزاناش زانایە

دەگێڕنەوە یەهوودییەک بەلای لادێیەکی موسڵمان نشیندا تێدەپەڕێت و دەیەوێت هەندێ گومان بخاتە دڵی زانا موسڵمانەکانی ئەو ناوچەیە.

پێش ئەوەی بگاتە لادێکە شوانێکی بینی مەڕەکانی دەڵەوەڕاند، لە دڵی خۆیدا وتی:

- وا چاکە لەم شوانە نەزانەوە دەست پێ بکەم، چەند گومانێک بخەمە بیریەوە لەسەر ئیسلامەتیەکەی.

یەهوودییەکە لە شوانەکە چووە پێشەوە و وا خۆی دەرخست کە موسڵمانێکی ڕێبوارە.

له تەنیشتیەوە دانیشت و پاش ماوەیەک یەهوودییەکە وتی:
- هەست ناکەی ئێمەی موسڵمان توشی زەحمەت و نارەحەتیەکی زۆر دەبین لە لەبەرکردنی قورئان چونکە سی جوزئە؟
ئەمە لە کاتێکدا کە دەیان ئایەتی لێکچوی تێدایە بۆ ئەو دووبارانە نەسڕینەوە؟ چونکە بەڕاستی ئەوە هێندەی تر کارەکەی قورستر کردووە!!
بەس بزانم دوبارە کردنەوەی چ سودێکی هەیە؟ بەدەم زەردەخەنەیەکی فێڵبازانەوە بەردەوامی دا بە گومانەکانی... دواتر وتی:
- گەر ئەمانە بسڕینەوە ئاسانتر لەبەر دەکرێ و ئاسنتریش مراجعە دەکرێتەوە.
هەموو ئەو کاتەی یەهوودییەکە قسەی دەکرد شوانەکە بە بێدەنگی مایەوە و هیچ قسەیەکی نەکرد.
کە تەواو بوو شوانەکە بە یەهوودییەکەی وت:
- وشەکانت جوان و باوەڕپێکەرن!
یەهوودییەکە زۆر بە قسەی شوانەکە دڵخۆش بوو، هەستی کرد شوانەکە کەوتە داوی وتەکانی!
دواتر شوانەکە وتی:
- بەڵام منیش پرسیارێکم هەیە، ئەویش ئەوەیە، تۆ چەند ئەندامێکی لێکچوت هەیە لە جەستەتدا... دوو دەست دوو قاچ دوو گوێ دوو چاو...ئەگەر بێتوو دووبارەکان لێبکەیتەوە کێشت دادەبەزێت د

هەڵگرتنییان ئاسانتر دەبێت و خواردنی و تێچووەکەش کەمتر دەبێتەوە!

یەهوودییەکە خۆی کۆکردەوە و دەموچاوی ڕەش هەڵگەڕاو کەوتە ڕێ.

لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- ئەگەر ئەمە وڵامی شوانەکەیان بێت دەبێ وەڵامی زاناکانیان چۆن بێت!

- **پیاوێکی نابینا شەوێک چرایەک بە دەستەوە دەگرێت**

گۆزەی دەخاتە سەرشانی و دەڕوات...

پیاوێکی دەگاتێ دەڵێ:

- برادەر بۆ تۆ شەو و ڕۆژ هەر وەکو یەکە، خۆتۆ هیچ نابینی ئەو چرایە چییە بە دەستەوە؟

نابیناکەش پێکەنی و وتی :

- ئەو چرایە کە هەڵمگرتووە لەبەر خۆم نیە، بەڵکو لەبەر کەسێکی وەکو تۆی چاو ساغە، نەوەک چاوی نەم بینێ و گۆزەکەم لێبشکێنێ.

- **بۆ نوێژ ناکەی؟**

پرسیارم لێی کرد :

- بۆ نوێژ ناکەیت؟

وەڵامی دایەوە و وتی:

- دوعام بۆ بکە خودا هیدایەتم بدات و نوێژەکانم بکەم.

لە کاتێکدا ئەو دەڕۆیشت بۆ سەر کارەکەی و بەپەلەبوو.

- وتم: مەڕۆ

- وتی: بۆ نەڕۆم؟

- وتم : من دوعات بۆ دەکەم خودا ڕزقت بدات!

## • پاسەوانی بانک

پیاوێک هەموو شەوێک لەنزیکی بانکەکە دەڕۆیشت و بەتوندی دەیدا لەدەرگای بانکەکە.

کاتێک پاسەوانی بانکەکە دەهاتە دەرەوە پیاوەکە ڕایدەکرد!

پیاوەکە هەموو شەوێ ئەو کارەی دووبارە دەکردەوە.

هەتا شەوێک پۆلیس بۆسەیەکیان بۆ داناو پیاوەکەیان گرت...لێیان پرسی:

- کاکە تۆ کێشەت چیە؟بۆچی ئەدەی لەدەرگاکە و دواتریش ڕادەکەی؟

ئەویش وەڵامی دانەوە و وتی:

- من تۆزێ پارەم لەو بانکە هەیە، جا ئەترسم شەوێک دز بێت و ئێوە خەوتبن، بۆیە هەموو شەوێک دێم لە دەرگا دەدەم تا بزانم پاسەوانەکان ئاگایان لە خۆیانە یان نا؟

**• دونیا بەندیخانەی باوەڕدار و بەهەشتی بێ باوەڕانە**

قورتوبی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لە کتێبی (جمع الحرص بالقناعة) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: یەهوودییەک کە جلێکی شڕ و پیسی لەبەربوو دەچێتە لای سهەلی الصعلوکی خوراسانی و لێی دەپرسێت: بۆچی ئێوە پێتان وایە کە پێغەمبەرەکەتان فەرموویەتی: ((الدنیا سجن المؤمن وجنة الكافر)) واتە: ((دونیا بەندیخانەی باوەڕدار و بەهەشتی بێ باوەڕانە))؟

لەکاتێکدا من کەسێکی بێ باوەڕم، ئەوەش ژیان و گوزەرانمە!

کەچی تۆ باوەڕداریت و لە ژیانێکی خۆشدا دەژیت!! کەی ئەوە بەندیخانەیە؟

ئەویش هەر زوو وەڵامی دەداتەوە و وتی:

ئەگەر بەیانی بەو بێ باوەڕییەوە بچیتەوە لای پەروەردگار و بەرەو دۆزەخ حەشرت بکەن، ئەوا ئەو دونیایە بۆ تۆ بەرامبەر بە ئەوێ وەک بەهەشتێک وا دەبێت.

ئەگەر منیش بە باوەڕەوە بەو بگەم و بەهەشتم بە قیسمەت بێت، ئەوا ئەو دونیایەم بەرامبەر بەو بەهەشتە نەبڕاوەیە وەک زیندانێکی لێ دێت!

**• بۆچی ئافرەتانی ئیسلام سڵاو لە هەموو پیاوێک ناکەن؟**

پیاوێکی ئینگلیز لەگەڵ د. ڕاتب نابلوسی گفتوگۆیەک دەکات و پێی دەڵێ:

- بۆچی ژنانی ئێوە سەلام لە هەموو پیاوێک ناکەن؟
- دکتۆر: ئایا لای ئێوە هەموو پیاوێک دەتوانێ سەلام لە شاژنی بەریتانیا بکات و تەوقەی لەگەڵدا بکات؟
- پیاوە ئینگلیزەکە: بێگومان نەخێر، بەڵکو یاسا حەوت جۆرە کەسی دیاریکردووە کە بۆیان هەیە لەگەڵ شاژن بدوێن و سەلامی لێبکەن و تەوقەی لەگەڵدا بکەن.
دکتۆر: ئافرەتانی ئێمەش هەروان، تەنها چەند کەسێک بۆیان هەیە سەلامیان لێبکەن و تەوقەیان لەگەڵدا بکەن...بەمەش لای ئێمە هەموو ئافرەتێک شاژنە هاوشێوەی شاژنەکەی ئێوە، بەڕاستی ئافرەت لە ئایینی ئێمەدا وەک گەوهەر و مرواری وایە!!!

## • شاعیر و پاشایەک

شاعیرێک چوو بۆ لای پاشایەک، لە کاتێکدا کە پاشا خەریکی نان خواردن بوو، پاشا بانگی شاعیرەکەی کرد و پێی گوت: کاکی شاعیر.
- شاعیر وتی : بەڵێ خاوەن شکۆ.
- پاشا گوتی :"وا ! "
- شاعیرەکەش ڕاستەوخۆ وتی :"إنّ"
پاشا زۆر توڕەبوو و فەرمانی کرد بیکەنە دەرەوە...دارو دەستەی پاشا سەریان سوڕمابوو، بۆیە لە پاشایان پرسی:

- خاوەن شکو، ئێمە هیچ تێنەگەیشتین تۆ وتت " وا "ئەویش گوتی " إن"، ئەو " وا " و"إن"ەیە چی بوو؟!

- پاشا گوتی:من کە گوتم: "وا" مەبەستم لەو ئایەتە بوو کە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴾ [الشعراء: ٢٢٤] واتە: ((تەنیا سەرگەردان و سەرلێشێواوەکان باوەڕ بە شاعیران دەکەن و شوێنیان دەکەون!)).

- ئەویش لە وەڵامدا وتی :"إن"مەبەستی لەو ئایەتە بوو کە دەفەرمووێت: ﴿ ..إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴾ [النمل: ٣٤ ] واتە: ((..پاشاکان بچنە ناو هەر ئاوەدانییەکەوە تێکی دەدەن و کەسانی پایە بەرز نزم دەکەنەوە، ئەوە کاری ئەوانە!)).

- **وەڵامێکی جوانی شەماڵ موفتی (ڕەحمەتی خودای لێبێت)**

لە کاتی نەخۆشیەکەی یەکێک لە قوتابییەکانی لە مامۆستا شەماڵ موفتی دەپرسێ:

- مامۆستا هەستت چۆنە لەگەڵ نەخۆشیەکەت؟

- ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: چل ساڵە وانەی سەبر و خۆڕاگری دەڵێمەوە، وا ئێستا بە کردەوە خۆم جێ بەجێی ئەکەم .

- **سوعبەتێک لە نێوان پێغەمبەر (ﷺ) و پێشەوا عەلی.**

ڕۆژێک پێغەمبەری خودا (ﷺ) و پێشەوا عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) بەیەکەوە دانیشتبوون و خورمایان دەخوارد، پێشەوا عەلی حەزی کرد کە سوعبەتێک لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) دا بکات، بۆیە هەر خورمایەکی دەخوارد ناوکەکەی دەخستە پێش پێغەمبەری خودا (ﷺ). وەک بڵێی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) خواردوویەتی، هەتا هەموو خورماکەیان خوارد، کە تەواوبوون پێشەوا عەلی بە پێغەمبەر (ﷺ)ی وت:

- بەڕاستی سەیرە پێغەمبەری خودا ئەو هەموو خورمایەت خواردووە؟ بەڕاستی سەیرە!! پێغەمبەری خوداش (ﷺ) بە پێشەوا عەلی وت:

- ئەوە سەیر نیە من ئەوەندە خورمایەم خواردووە، بەڵکو ئەوە سەیرە پیاو هەیە خورما بە ناوکەوە دەخوات!!! ڕوحم بە فیدای بێت.

- **بۆچی بە پێنج پەنجە نان دەخۆی؟؟**

لە بالولیان پرسی:

- بۆچی لەبەرچاوی خەڵک بە هەر پێنج پەنجەکەت نان دەخۆی؟؟

- بالول: لەبەر ئەوەی شەش پەنجەم نیە.

## • سەرت سپی و ڕیشت ڕەشە

بۆ ئیحراجکردن پرسیاریان لە مەلیک فەیسەڵ کرد:

- بۆچی ڕیشت ڕەش و سەرت سپییە؟

- ئەویش وتی: چونکە قژی سەرم بیست ساڵ لە ڕیشم گەورەترە.

## • چی منت لا جوانە؟

گەنجێک بە دڵدارەکەی دەڵێت:

- ئای خودا چەندە جوانی!!

- کچەکە: خۆزگە تۆش جوانبویتایە تا منیش وام بیۆتبایت!!

- گەنجەکە: قەیناکە تۆش وەکو من درۆیەک بکە ئاساییە.

## • تۆ دووەم جوانترینی دونیایت

ئافرەتەکەی زۆر دڵتەنگ بوو، ئەویش ویستی دڵی بداتەوە، بۆیە پێی وت:

- تۆ دووەم جوانترین ئافرەتی دونیایت!

- ئافرەتەکە: ئەی یەکەمیان کێیە؟

- پیاوەکە: هەر خۆتی ئەوساتەی پێدەکەنی.

## • هەژار و ڕەزیلێک

هەژارێک دەچێتە بەردەرگای ماڵی کابرایەکی ڕەزیل و چەتوون، هەژارەکە دەڵێ:

- بیستومە کە تۆ بەشێک لە پارە و سامانی خۆت نەزر کردووە و دەیبەخشی، منیش زۆر هەژارم، هاتووم تا یارمەتیەکم بدەیت.

- پیاوە ڕەزیلەکە: ئاخر ئەو نەزرەی من تەنها هەژارە نابیناکان دەگرێتەوە و تۆ چاو ساغی بۆیە هیچت پێنادەم.

- پیاوە هەژارەکە: لە ڕاستیدا کوێری ڕاستەقینە منم، چونکە ئەگەر کوێر نەبامە نەدەهاتمە بەردەم دەرگای کەسێکی وەک تۆی ڕەزیل!

## • هەرشتێک دیار نەبێت بوونی نیە؟

لە زانکۆیەکدا مامۆستایەک دەپرسێت:

- ئایا کەس هەیە خودای بینیبێت ؟!

کەس وەڵامی نەبوو.

مامۆستاکە بەردەوام بوو...

- ئایا کاس هەیە گوێی لەدەنگی خوا بوبێت؟!

کەس وەڵامی نەبوو

- ئایا کەس هەیە دەستی لە خودا دابێت؟!

کەس وەڵامی نەبوو

- مامۆستاکە وتی: کەواتە خودا بونی نیە!

یەکێک لە خوێندکارەکان هەستا سەرپێ و وتی:
- ئایا کەس هەیە مێشکی مامۆستای بینیبێت؟!
کەس وەڵامی نەبوو....
قوتابییەکە بەردەوام بوو...
- ئایا کەس هەیە گوێی لە دەنگی مێشکی مامۆستا بووبێت؟!
کەس وەڵامی نەبوو
ئایا کەس دەستی لە مێشکی مامۆستا داوە؟!
کەس وەڵامی نەبوو
ئینجا قوتابییەکە وتی: کەواتە مامۆستا مێشکی نییە.

- **دکتۆر زاکیر و شێخ دیدات**

دکتۆر زاکیر قوتابی شێخ ئەحمەد دیدات بووە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).

ڕۆژێک شێخ ئەحمەد بە دکتۆر زاکیری وتوە.
- بە (٣) ساڵ بەشی (٣٠) ساڵی من فێر بوویت ماشاء الله!
- دکتۆر زاکیریش وەک ڕێزێک بۆ شێخ لە وەڵامدا دەڵێت: ماشاء الله لە تۆ ئەی شێخ بە (٣) ساڵ بەشی (٣٠) ساڵت فێر کردم!

- **نەسرانییەک و داعشێک**

داعشێک لە بازگەکەیان سەیارەیەک ڕادەگرێت کە خاوەنەکەی نەسرانیە.

- داعشەکە دەڵێت: ئایا تۆ موسوڵمانی؟
- نەسرانیەکەش دەڵێت: بەڵێ من موسوڵمانم.
- داعشەکە: ئەگەر موسوڵمانیت ئەوا تۆزێک قورئانم بۆ بخوێنە.
- نەسرانیەکە کەمێک لە ئینجیلی بۆ دەخوێنێتەوە.
- داعشەکە: دە باشە بڕۆ.
هاوسەری نەسرانیەکە دەڵێت:
- بۆچی ئینجیلیت بۆ خوێندەوە؟ خۆ ئەگەر بیزانیانە دەیکوشتین.
نەسرانیەکە دەڵێت: خەمت نەبێت، ئەگەر ئەمانە قورئانیان بزانیبایە ئەوا هەرگیز ئەو کارانەیان نەدەکرد.

## • خوا حەزناکەت ئەی بۆچی؟

مامۆستایەک بۆ سەرشێواندن و گومڕاکردنی قوتابیەکانی وتی:
- باشە مادام خودا حەزدەکەت گشت مرۆڤەکان بچنە بەهەشتەوە بۆ هەر لەسەرەتاوە نایانبات؟
یەکێک لە قوتابیەکانیش دەستی هەڵبڕی و وتی:
- مامۆستا تۆ حەزناکەیت هەموومان لە تاقیکردنەوەکان دەربچین و نمرەی تەواو بهێنین؟؟
- مامۆستا: با بێگومان.
- قوتابیەکە: ئێ دەکەواتە هەر لە ئێستاوە نمرەیەکی باشمان بۆ دابنێ و با هەمووومان دەربچین!
مامۆستاکە وشک و مات بوو و نوقەی لێبرا.....

## • منیش دەمخواردەوە

ژنێکی زۆر ناشیرین بە پیاوێکی وت:

- ئەگەر تۆ هاوسەری من بویتایە ژهەرم دەخستە نێو قاوەکەتەوە.

پیاوەکەش وتی:

- منیش یەکسەر دەمخواردەوە!!

## • پارێزگاری لە سروشتی خۆت بکە

دانایەک لە قەراغی ئاوێک دانیشتبوو.

بینی دوپشکێک کەوتۆتە ئاوەکەوە.

داناکە هەوڵیدا یارمەتی بدا و دەریبهێنێ، کاتێک دەستی لێ نزیک کردەوە دوپشکەکە بە داناکەیەوەدا، ئەویش ئاخێکی کرد و دەستی گێڕایەوە، دوای کەمێک کەمێک هەوڵی دووەمی دا... دیسان پێوەیدا! و دوبارە ئاخی کرد. و جاری سێیەمیش ویستی هەوڵ بدا بۆ دەرهێنانی.

کەسێکیش کە هەر لەسەرەتاوە تەماشای حەکیمەکەی دەکرد و وتی:

- قوربان دەرس و پەندت وەرنەگرت لەو (٢) جارە؟

- حەکیمەکە لە سێیەمین هەوڵیدا سەرکەوت و دوپشکەکەی ڕزگار کرد لە خنکاندن، پاشانیش ڕووی کردە ئەو کەسەی کە پرسیاری لێکرد و وتی:

کوڕی شیرینم: سروشتی دوپشک پێوەدانە، سروشتی منیش ئاشتی و یارمەتیدانە، بۆ بهێڵم سروشتە دڕندەکەی ئەو سەرکەوێ بەسەر سروشتە پڕ ڕەحمەتەکەم و بەخشندەییەکەی من؟!

## • وەڵامی پەرتووک فرۆشێک

پیاوێک دەچێتە پەرتووکخانەیەک بۆ ئەوەی پەرتووکێک بکڕێت، دوای گەران پەرتووکێکی هەڵبژاردە و بەرزی کردەوە و نیشانی خاوەنی کتێبخانەکەیدا و وتی:

- ئەم پەرتووکە باسی چی دەکات؟

پەرتووکفرۆش وتی:

- نــازانم.

پیاوەکە وتی:

- چۆن پەرتووک دەفرۆشی ، کە نەتخوێندۆتەوە و نازانی چی لە ناودایە ؟

پەرتووکفرۆش وتی:

- بۆ ئەگەر دەرمانفرۆش بم ،دەبێ تامی هەموو دەرمانەکان بکەم تا بزانم چی لە ناو دایە؟!

## • گەمژە هەمیشە کار بە گومان دەکات

کوڕێکی گەنج بە پیرە پیاوێکی وت:

- گومان دەبەم تۆ گەمژەبیت!!

پیاوەکەش بێ ئەوەی خۆی تێک بدات وتی:
- گەمژە کەسێکە کە هەمیشە کار بەگومانەوە ئەکات..

## • دانایی ئافرەتێک

ڕۆژێک پیاوێک زۆر لەژنەکەی توڕە دەبێت و پێی دەڵێت:
- بڕۆرەوە بۆماڵی باوکت وهەرچی گرنگە لە ماڵەکەدا ببیە و وازم لێبێنە.
- ژنەکەشی دەڵێت: هەستە پێشم بکەوە بۆ ماڵی باوکم.
- پیاوەکە دەڵێت: بۆچی؟
- ژنەکەش بەزەردەخەنەیەکەوە دەڵێت: چونکە تۆ بەلای منەوە گرنگترین شتی ماڵەکەمانی!

## • بالول و خزمەتکارەکە

یەکێک لە خزمەتکارەکانی هاڕونە ڕەشید کە نیوەڕوان ماستی خواردبوو هەندێکی بە ڕدێنیەوە نووسا بوو، ئەو خزمەتکارە بالولی پێ شێت بوو هەمیشە دەیوویست بیشکێنێتەوە، بالول هەر زوو لێی پرسی:
- ئەمڕۆ چیت خواردووە؟
- خزمەتکارەکە: ئەمڕۆ کۆترم خواردووە.
- بالول وتی: هێشتا واتنەوتبوو زانیم کە کۆترت خواردووە!!
- خزمەتکارەکە: چۆن زانیت؟

- بالول: چونکە جیقنەکەی بە ڕیشتەوە نووساوە!
کابرا سورهەڵگەڕا و ئەویی جێهێشت.

## • برۆ فێری بوێری و پیاوەتی ببە

کوڕێک هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکدا کرد، کچەکە تەمەنی زۆر منداڵ بوو، ڕۆژێکیان کۆمەڵێک هاوڕێی کوڕەکە هاتن بۆ سەردانی هاوڕێکەیان، ئەویش بەگەرمی و ڕێزەوە بەخێرهاتنی کردن، دواتر داوای لەخێزانەکەی کرد کە گۆشتی مەڕیان بۆ ئامادە بکات و خواردنێکی بەتامیان بۆ لێبنێت.

- هاوسەری کوڕەکە وتی: نازانم گۆشتی مەڕ لێبنێم و خواردنی گەورە ئامادە بکەم، چونکە لە ماڵی باوکم فێری ئەوەیان نەکردووم.

کوڕەی تازە زاوا زۆر دڵگران بوو بە وەڵامی خێزانەکەی و پێی وت:

- خۆت کۆبکەرەوە، دەتبەمەوە ماڵی باوکت، چونکە تۆ ناتوانیت وەک هاوسەرێکی سەرکەوتوو ڕەفتار بکەیت.

کاتێک گەیشتنەوە ماڵی باوکی کچەکە، هاوسەری کچەکە بە خەزووری وت:

- ئەوە کچەکەتانە هێناومەتەوە بۆتان، ناتوانێت خواردنی گۆشتی مەڕ بۆ میوانەکانم ئامادە بکات هەتا فێری دروستکردنی ئەو جۆرە خواردنەی نەکەن من نامەوێتەوە.

- باوکی کچەکەش بە دانایی و ژیرییەوە وتی:

- بۆ ماوەی دوو مانگ کچەکەمان لێرە دابنێ، هەتا بەباشی فێری دەکەین، دواتر وەرە بیبەرەوە بۆ ماڵی خۆت.

کچەش ماوەی دوو مانگ لە ماڵی باوکی مایەوە. دوای دوو مانگەکە هاوسەری کچەکە سەردانی ماڵی خەزوری کرد تا بزانێت هاوسەرەکەی فێری لێنانی ئەو جۆرە خواردنە بووە یان نا، بۆ ئەوەی بیباتەوە بۆ ماڵی خۆی.

- باوکی کچەکەش وتی: ئێستا کچەکەم بەباشی فێری خواردن دروستکردن بووە.

- هاوسەری کچەکەش وتی: زۆرباشە، ئێستا یارمەتیمان بدەن، ئێمە دەڕۆینەوە ماڵی خۆمان.

- بەڵام باوکی کچە وتی: پێویستە ئێمە لەوە دڵنیابین کچەکەمان فێربووە تا بەچاوی خۆت ببینی، پاشان مەڕێکی زیندووی هێنا و داوای لە زاواکەی کرد کە مەڕەکە سەر ببڕێت هەتا کچەکەیان بۆیان بکات بە خواردن.

- هاوسەری کچەکەش وتی: بەڵام من نازانم مەڕ سەر ببڕم !!

- باوکی کچەکەش وتی: باشە، بڕۆرەوە بۆ لای خزمەکانت، بۆئەوەی فێری پیاوەتی و بوێری ببیت، ئەگەر فێربوویت، وەرە کچەکەمان لەگەڵ خۆت ببەرەوە بۆ ماڵی خۆت!

**• ئێوە ڕاست دەکەن**

- لەپیرە پیاوێکیان پرسی: بەم تەمەنە ڕەنگت بۆ ئەوەندە جوان و دڵت هێندە ئارامە؟!

- وتی: له ژیانمدا موناقەشە و مشتومڕم لەگەڵ کەسدا نەکردووە.
- ووتیان شتی وانابێ مەحاڵە!
- وتی: ئێوەڕاست دەکەن!

### • زەوی دەڵێ: هەردووکتان هی منن

دوو کەس لەسەر پارچەیەک زەوی مشت و مڕیان بوو، دواتر چون بۆ لای پێغەمبەری خودا عیسا (علیه السلام)، هەریەک لەو دوو کەسە دەی وت: ئەی پێغەمبەری خودا زەوییەکە هی منە.

- پێغەمبەری خودا عیسا فەرمووی: بەڵام زەوییەکە شتێکی تر دەڵێت.

- وتیان: چی دەڵێت؟
- فەرمووی: دەڵێ هەردووکیان هی منن.

بۆیە دڵی یەکتر مەشکێنن و یەکتر زویر مەکەن.
هەمووتان دۆستی یەکبن.

### • ئایا نیشتمان یەکسانە بە جووتێک پێڵاو؟

- دادوەر: بەسە چیتر مەڵێ زوڵمم لێکراوە، فرمێسک هەڵمەوەرێنە و دڵ لە دڵ مەدە، سوێند بخۆ کە لە ڕاستی زیاتر هیچی تر ناڵێی؟
- تاوانبار: سوێند بێت گەورەم.
- دادوەر: دەست لەسەر کتێبە پیرۆزەکە دابنێ نەک تەلەفۆنەکە،
- تاوانبار: فەرمانتە گەورەم.

- دادوەر: بڵێ ڕۆژی ئەوەندە و ئەوەندە لە گۆڕەپانە گشتییەکان و شەقامە قەرەباڵغەکان گووتومە:
(نیشتمان یەکسانە بە جووتێک پێڵاو...؟)
- تاوانبار: بەڵێ گەورەم واموتووە.
- دادوەر: هەروەها بەرامبەر تابوری کرێکاران و جوتیاران؟
- تاوانبار: بەڵێ واموتووە گەورەم.
- دادوەر: هەروەها لەبەرامبەر پەیکەری شەهیدان و پاڵەوانانی وڵات؟
- تاوانبار: بەڵێ واموتووە گەورەم.
- دادوەر: هەروەها لە بەرامبەر ناوەندی خۆبەخشان و جەنگاوەرە دێرینەکان؟
- تاوانبار: بەڵێ واموتووە گەورەم.
- دادوەر: هەروەها لە بەرامبەر خەڵکێکی زۆر لە توریست و گەشتیاران؟
- تاوانبار: بەڵێ واموتووە گەورەم.
دادوەر: هەروەها لە بەرامبەر ڕۆژنامەکان و ئاژانسەکانی هەواڵ؟
- تاوانبار: بەڵێ واموتووە گەورەم.
- دادوەر: نیشتمان خەونی منداڵی و دڵخۆشی لاوێتی و بیروەریی پیریمانە، گۆڕستانی داگیرکەر و زاڵم و تەماعکارانە، هەموو شتێک لە پێناو نیشتمانە، جا ئەو شتە گران بێت یان هەرزان،
بە بڕوای تۆ یەکسانە بە جووتێک پێڵاو؟

ئاخر بۆ؟

بۆ؟

- تاوانبار: ئاخر گەورەم ئەو کات پێخواس بووم و تاکە پێڵاوێکیشم نەبوو!

- **ئایا هاوسەرەکەت لە شێر دڕندەترە؟؟**

ژنێک دەچێتە لای پیاوێکی دانا و پێی دەڵێت:

- من ناتوانم لەگەڵ پیاوەکەمدا هەڵبکەم و بەردەوام کێشەم لەگەڵیدا هەیە، تکایە چارەسەرێکم بۆ بدۆزەرەوە!!

- پیاوە داناکە: باشە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە پێویستە تۆ تاڵێک لە ڕیشی شێرم بۆبێنی!!

ژنەکەش ئەمەی زۆر لا ئاسان دەبێت و هەر زوو دەڵێ:

- باشە بەسەرچاو...

ماوەیەک ئەو ژنە بەبەردەوامی دەچێت بۆ دارستان و گۆشتێکی باشیش لەگەڵ خۆیدا دەبات...هەموو ڕۆژێ بڕێک گۆشت دەدات بە شێرەکە تاوای لیدێت دەبنە هاوڕێ و ئەویش لە دەرفەتێکدا تاڵێک لە ڕیشی دەردەهێنێ و بۆ داناکەی دەبات.

پیاوە داناکەش پێی دەڵێت:

- کچەکەم تۆ توانیت لەگەڵ شێرێکدا بسازێی و ببیتە هاوڕێ، چۆن ناتوانی لەگەڵ هاوسەرەکەتدا بسازێی، خۆ هاوسەرەکەی تۆ لە شێر دڕندەتر نیە!

ژنەکە سەری خۆی داخست و پەندێکی باشی لە تاقیکردنەوەی ئەو پیاوە دانایە وەرگرت...

### • بۆ خۆت ناچی؟

ڕۆژێکیان یەکێک لە هاوڕێکانی خەلیفە بە بالول دەڵێت:

- بۆ لێرە دانیشتووی، هەستە بڕۆ بۆ لای خەلیفە، چونکە هەر شێتێک بچێتە لای خەلیفە پێنج دیرهەمی دەداتێ، تۆش بڕۆ ئەو پێنج دیرهەمە بۆ خۆت وەربگرە.

- بالول: ئەی بۆ خۆت ناچی؟ دڵنیام تۆ بچی دە دیرهەمت دەداتێ! (مەبەستی ئەوەبوو تۆ لە هەموو خەڵک شێتتری).

### • لە تۆ جوانترم نەبینیوە!

پیاوێک بە کچێکی وت:

- زۆر دەمێکە دەگەڕێم لە تۆ جوانترم نەبینیوە، دڵنیاشم لە تۆ جوانتر نیە، بۆیە داوات لێدەکەم هاوسەرگیریم لەگەڵدا بکە...

- کچەش وتی: بەڵام ئەو ئافرەتەی دوای خۆت لە من جوانترە!!

- پیاوەکە بەخێرایی ئاوڕێکی دایەوە بەڵام هیچی نەبینی، زانی کەوا تاقیکرایەوە،کاتێک ئاوڕی بەلای کچەکە دایەوە، کچەکە پێی وت:

- ئەی نەتووت لە تۆ جوانتر نیە، کەواتە بۆ ئاوڕت دایەوە؟

پیاوەکە سەری شۆڕکرد و ڕۆی.

- **خودا هەیە؟ قەزاو قەدەر بوونی هەیە؟ شەیتان لە ئاگرە چۆن بە ئاگر سزا دەدرێت؟**

گەنجێک بەمەستی خوێندن دەچێتە یەکێک لەو وڵاتانەی کە تیایدا بیری سیکۆلاری زاڵ و تیایدا بەشێوەیەکی ئاشکرا دژایەتی ئایینی ئیسلام و بنەماکانی دەکرێن، هەر زوو کار لەسەر گۆڕینی بیروباوەڕی دەکرێت، ئەویش زۆر بە ئاسانی ملکەچی ویستەکانیان دەبێت و گومانگەلێکی دەکەوێتە مێشکەوە...کاتێک دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، بانگ دەدرێت، ئەویش هیچ خۆی تێک نادات و بگرە کەمێک بە دەنگەکە نارەحەتیش دەبێت، کاتێکماڵەوەیان لێیان پرسی بۆچی ناچیت بۆ نوێژ، کاتی نوێژە وتی:

- من ناتوانم بچم بۆ نوێژ تا زانایەکم بۆ نەهێنن و وەڵامی سێ پرسیارم نەداتەوە...

ئەوانیش کاتێک کە زانیان تەواو باوەڕی گۆڕاوە و مێشکی پڕکراوە لە گومان بەرامبەر بە وجودیەتی پەروەردگار و بنەماکانی ئیسلام، چوون زانایەکی لێهاتوویان بۆ هێنا...

- زاناکە: فەرموو کوڕی شیرینیم پرسیارەکانت بکە...

- گەنجەکە: پرسیارەکانم دەکەم، ئەگەرچی دەزانم سەدانی وەکو تۆ ناتوانن وەڵامی پرسیارەکانم بداتەوە...

- زاناکە: بپرسە، بە بەیارمەتی خودا وەڵامی پرسیارەکانت دەدەمەوە.

گەنجەکە پرسیارەکانم ئەمانەن:
- ئایا خودا بوونی هەیە؟ ئەگەر هەیە شێوەکەیم نیشان بدە.
- قەزاو قەدەر چییە؟
- ئایا کە شەیتان لە ئاگر بێت چۆن بە ئاگر ئازار دەخوات؟
هەر لەگەڵ تەواو کردنی پرسیاری سێیەم زاناکە زلەیەکی توندی لە ڕووخساری گەنجەکەدا...
- گەنجەکە: تۆ کە ناتوانی وەڵامی پرسیارەکانم بدەیتەوە بۆ لێم دەدەیت و ئازارم دەدەیت؟؟
- زاناکە ئەو زلەیە وەڵامی هەر سێ پرسیارەکەت بوو!!
- گەنجەکە: چۆن؟ تێناگەم!
- زاناکە: ئایا بەو زلەیە هەستت بە ئازار کرد؟
- گەنجەکە: بێگومان هەستم پێکرد.
- زاناکە: کەواتە پێت وایە کە ئازار بوونی هەیە؟
- گەنجەکە: بەڵێ، بێگومان.
- زاناکە: کەواتە شێوەی ئازارم نیشان بدە.
- گەنجەکە: ناتوانم.
- زاناکە: ئەوە وەڵامی پرسیاری یەکەمتە، هەموومان هەست بە بوونی خودا دەکەین، بەڵام ناتوانین بیبینین.
دواتر زاناکە درێژەی بە وتەکانیدا و وتی:
- ئایا دوێنی دەتزانی کە من ئەمڕۆ ئەو زلەیەت لێدەدەم؟
- گەنجەکە: نەخێر.

- زاناکە: ئەوەش وەڵامی پرسیاری دووەمتە، ئەوە قەزا و قەدەرە.
- زاناکە: ئەی دەزانی دەستی من لە چی دروستکراوە؟
- گەنجەکە: لە خۆڵ.
- زاناکە: ئەی ڕووخساری تۆ لە چی دروست کراوە؟
- گەنجەکە: بێگومان ئەویش لە خۆڵ.
- زاناکە: دوای ئەوەی زلەکەم لێتدا هەستت بەچی کرد؟
- گەنجەکە: بێگومان ئازار.
- زاناکە: تەواو، ئەوەش وەڵامی پرسیاری سێیەمتە، ڕووخساری تۆ لە خۆڵ دروستکراوە و بە خۆڵ ئازارت چەشت، کەواتە چی ڕێگرە لەوەی کە شەیتان کە لە ئاگر دروستکراوە بە ئاگر ئازار بدرێت؟

### • لێهاتوویی دادوەرێک

کاتێک دادگا خەریکبوو حوکمی لەسێدارەدان بۆ ئەو کەسە دەربکات کە بە تۆمەتی کوشتنی هاوسەرەکەی دەستگیر کرابوو، لە کاتێکدا هێشتا تەرمەکەی نەدۆزرابوویەوە، بەڵام گشت بەڵگەکان لە دژی تاوانبارەکە بوون... پارێزەری تاوانبارەکە هەوڵی دەدا تاوانەکە لەسەر پیاوەکە لابدات و بێ تاوانی بسەلمێنێت، بە دادوەرەکەی وت:
- بۆ ئەوەی حوکمی لەسێدارەدان بەسەر تۆمەتبارەکەدا بدەیت... پێویستە دادگا هیچ گومانێکی نەبێت کە تاوانەکە ئەو پیاوە ئەنجامی داوە.
دوای کەمێک بیرکردنەوە.

- پارێزەرەکە وتی: ئێستا هاوسەرەکەی لە دەرگای دادگا دێتە ژوورەوە ... کە ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر بێتاوانی تۆمەتبار و دەیسەلمێنێ کە هاوسەرەکەی نەمردووە و زیندووە!

دەرگای دادگا کرایەوە و هەموو ئەوانەی لە هۆڵی دادگا ئامادەبوون سەرنجیان خستە سەر دەرگاکە.

دوای چەند ساتێک بێدەنگی و چاوەڕوانی .. هیچ کەس نەهاتە ژوورەوە ... لێرەدا پارێزەرەکە وتی: هەمووتان چاوەڕێی هاتنە ژوورەوەی کوژراوەکەتان دەکرد !!

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئێوە لە سەدا سەد دڵنیا نین کە ئەم پیاوە هاوسەرەکەی کوشتووە !!

هەموو ئەوانەی لەوێ بوون سەرسام بوون بە زیرەکی پارێزەرەکە... دادوەرەکە تاوتوێی کەیسەکەی کردەوە و بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ تۆمەتبارەکە دەرکرد! دوای ئەم بڕیاردانە خەڵکەکە پرسیاریان لە دادوەر کرد چۆن بڕیارێکی لەم جۆرەتان دەرکرد لە کاتێکدا پارێزەرەکە بەڵگەیەکی جوان و زیرەکانەی نیشاندا؟

دادوەرەکە وەڵامی دانەوە و وتی:

- کاتێک کە پارێزەرەکە بە هەموومانی ڕاگەیاند کە هاوسەری تاوانبار زیندووە و نەمردووە و ئێستا دێتە ژوورەوە، هەموومان سەرنجمان خستبووە سەر دەرگاکە تەنها یەک کەس نەبێت، ئەویش

پیاوە تۆمەتبارەکە بوو، چونکە باش دەیزانی کە هاوسەرەکەی کوژراوە و مردووە و هەرگیز نایەتە ژوورەوە!

**• لە کەیەوە خودا بوونی هەیە؟**

پیاوێک بە (عبدالله)ی کوڕی ئەبو داود دەڵێ:

- لە کەیەوە خودا بوونی هەیە؟

- ئەویش دەڵێ: جا کەی نەبووە؟

**• نرخی من چەندە؟**

ڕۆژێکیان دادوەر هەر بۆ خۆشی لەمەلا مەشهوری پرسی:

- نرخی من جەندە ؟

- مەلا مەشهوریش: گوتی (٣٠) دینار جەنابی دادوەر.

- دادوەر توڕەییەوە وتی: هەی پیاوی نەزان من بەس جلەکانم بایی ٣٠ دینارە...

- مەلا مەشهوریش وتی: ئێ منیش تەنها نرخی جلەکانتم وت، ئەگەرنا خۆت فلسێک ناهێنێ!

**• وەڵامێکی بێ دەنگکەر لەلایەن سەروەرمان (ﷺ)**

لە (أبی سلمە)ی کوڕی (عبدالرحمن)ەوە لە(أبی هوڕیرەوە) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

- (تەنینەوەی نەخۆشی و مانگی سەفەر و بایەقوش کاریگەرییان نیە).

دەشتەکیەکیش کە لەوێ ئامادە بوو وتی:

- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی بۆ چی وشترەکانی من لەناو لمدا دەڵێی ئاسکن، تا وشترێکی گەڕۆڵ دێت و دەکەوێتە ناویان هەمویان گەڕۆڵ دەکات؟

فەرمووی: (ئەی کێ یەکەم وشتری توش کرد؟)[1].

---

(١) بێباوەڕان چەند فەرموودەیەک بڵاو دەکەنەوە دەڵێن محمد نەی زانیووە کە نەخۆشی دەگوازرێتەوە، لە کاتێکدا زانست و هەموو خەڵکیش ئەوە دەزانن کە نەخۆشی دەگوازرێتەوە، بەڵام محمد دەڵێ ناگوازرێتەوە نموونەش بە چەند فەرموودەیە دەهێننەوە یەکێکیش لەو فەرموودانە ئەوەی کە ئێمە لەسەرەوە هێناومانەتەوە...

بەڵام لە ڕاستیدا پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) لەم فەرموودەیەدا مەبەستی ئەوەیە کە بیرورایەی ئەم خەڵکە ڕاست بکاتەوە کە وابیریان دەکردەوە کە نەخۆشی لەخۆیەوە و بەبێ فەرمانی خودا بڵاو دەبێتەوە، خودا هیچ دەسەڵاتێکی لە دروست بوونیدا نییە، مەبەستی پێغەمبەری خوداش (ﷺ) هەر ئەوەیە کە هەموو شتێک کە ڕوو دەدات بە فەرمانی پەروەردگارە، ئەمە لە کاتێکدا کە چەندین فەرموودەش هەن کە تیایدا ئەوە دەسەلمێنن کە پێغەمبەری خودا زانستی بەوە هەبووە کە نەخۆشی لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، لە گیاندارێک بۆ گیاندرێکی تر دەگوازرێتەوە و خەڵکی لەو مەترسیە

- ئیرادە لە شمشێرە بەهێزترە

- یەکێک لە خوێندکارەکان لە مامۆستاکەی خۆی پرسی:
- باشترین شمشێر وەشێن کێیە؟
- مامۆستاکەی وتی: لەو ڕێگایەوە بڕۆ، لەسەر ڕێگاکەت تاشەبەردێک هەیە، لەو بپرسە وەڵامت دەداتەوە!!!
- خوێندکار: چۆن شتی وا دەبێت، خۆ بەرد وەڵام ناداتەوە!!!
- مامۆستا: باشە ئەگەر وەڵامی نەدایتەوە شمشێرەکەت دەربهێنە و هێرشی بکەرە سەر و وردیبکە.
- خوێندکار: شتی واناکەم مامۆستا، چونکە شمشێرەکەم دەشکێت، خۆ ئەگەر بەدەستیش هێرشی بکەمە سەر دەستەکانم دەشکێن، بەردەکەش هیچی لێ نایەت، من مەبەستم ئەوە بوو باشترین شمشێر وەشێن کێیە؟
- مامۆستا: باشترین شمشێر وەشێن وەک ئەو بەردەیە، بێ ئەوەی هێرش بکاتە سەرکەس، بێ ئەوەی شمشێرەکەی لە کەلان دەربهێنێت، بە ئیرادەیەکی بەهێزەوە پیشانی دەدات، کە کەس ناتوانێت بیشکێنێت وبیروخێنێت.

---

ئاگادارکردۆتەوە، بەڵام بابەتی پەرتووکەکەمان بواری ئەوە نادات کە چەند فەرموودەیەک باس بکەین...

بەبێ ئیرادەیەکی بەهێز شمشێر کەس بەهێز ناکات، کەواتە ئیرادە لە شمشێر بەهێزترە.

## • خۆت چاکبە چاکەت دێتە ڕێگا

پیاوێکی هەژار هەبوو کە هاوسەرەکەی (کەرە)ی دروست دەکرد.
ئافرەتەکە کەرەکانی لە شێوەی بازنەیی دروست دەکرد و کیلۆ کیلۆ دەیخستە زەرفێکەوە، پیاوەکەش هەموو ڕۆژێک کەرەکانی بە یەکێک لە دوکاندارەکانی شار دەفرۆشت....

ڕۆژێکیان کابرای دوکاندار گومانی لە سەنگ و کێشی کەرەکان کرد، بۆیە جارێکی تر سەنگی کردنەوە!! بەڵام بینی کە کێشی هەر کەرەیەک تەنها ٩٠٠ گرام بوو!!

دوکاندارەکە زۆر بە تووڕەیی بە کابرای هەژاری وت:

- ئێوە بە حسابی یەک کیلۆیی کەرە بە من ئەفرۆشن، کەچی وا ئەبینم کە هەمویان تەنها ٩٠٠ گرامن، ئێوە لە خوا ناترسن، بەڵێن بێت چیتر لە ئێوەی نەکڕم!!!

کابرای هەژار سەری داخست و وتی:

- ئێمە لە ماڵەوە تەرازومان نیە، زەرفە کەرەکان بەو یەک کیلۆ شەکرە دەکێشین کە لە لای تۆ کڕیوومانە!!!

## • تۆلستۆ و ژنێک

ڕۆژێکیان لیۆ تۆلستۆی بە شەقامێکدا دەڕۆیشت، لەناکاو شانی بەر ژنێک کەوت.

ژنەکەش بەبێ هیچ وەستانێک دەستی کرد بە جنێودان و قسەی ناشیرین.
تۆڵستۆش لەبەرامبەر ئەو هەموو جنێوانەدا، کڵاوەکەی لەسەری خۆی هەڵگرت زۆر بەڕێزەوە وتی:
- بمبوورە خانمەکەم من لیۆ تۆلستۆی نووسەری ڕووسیم..
ژنەکە زۆر هەستی بە شەرمەزاری کرد و وتی:
- بمبورە بەخوا نەمزانی تۆڵستۆی، باشە بۆچی زووتر خۆت نەناساند؟
- تۆڵستۆ: خانمەکەم تۆ هێندە بە قوڵی چووبوویتە نێو خۆ ناساندنی خۆت بواری ئەوەت نەدا من خۆم بناسێنم!!

## • کەواتە خەم لەچی دەخۆی

ئیبڕاهیمی کوڕی ئەدهەم بەلای پیاوێکدا تێپەربوو کە ئەژنۆی خەمانی لە باوەش گرتبوو، ئەویش گەڕایەوە لای و پێی وت:
- ئەی پیاو، ئایا لەم کەونەدا شتێک بەبێ ویستی خودا دەڕوات و ڕوودەدات؟؟
- پیاوەکە: بەدڵنیاییەوە نەخێر.
- ئیبڕاهیم: ئایا چرکەیەک لەو تەمەنەت کەم دەکات کە خودا بۆی داناویت؟؟
- پیاوەکە: بێ گومان نەخێر.
- ئیبڕاهیم: کەواتە خەم لەچی دەخۆیت؟

- **کەواتە سەرەتا خۆت فێرە ئەدەب بکە**

کاتێک ئیسماعیلی کوڕی حەمادی کوڕی ئەبو حەنیفە هاتە بەسرە وتی:

- بۆ ئەوە هاتوومە ئێرە تا هەر کەسێک پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئەبوو حەنیفە قسە بکات و موخالەفەی بکات فێری ئەدەبی بکەم...

یەکێکیش پێی وت:

- ئایا ئەبوو حەنیفە هەر کەسێک پێچەوانەی ئەوی وتبا سزای دەدا و فێری ئەدەبی دەکرد؟

- ئیسماعیل وتی نەخێر.

کابرا پێی وت:

- کەواتە سەرەتا خۆت فێرە ئەدەب بکە، چونکە بەڕاستی تۆ موخالەفەی ئەبو حەنیفەت کردووە.

- **ئایا ڕوتی بەرەو پێشچوونە؟**

کۆمەڵە ڕۆژنامەنووسێک پرسیار لە پزیشکێکی ئافرەتی موسڵمان دەکەن، سەبارەت بەو جل و بەرگانەی کە دەیانپۆشێت:

- جەنابی دکتۆرە زۆر سەیرە جل و بەرگەکان لە ئاستی زانستی خۆتدا نین، خۆت لە ئاستێکی بەرزی زانست و مەعریفەدایت، کەچی جلەکانت نیشانەی دواکەوتووی و جەهالەتن؟

پزیشکە باڵاپۆشەکەش وەک نەریتی هەمیشەیی خۆی، زۆر بەنەرم و نیانی وەڵامی دانەوە و وتی:

- مرۆڤ سەرەتا ڕووت بوو، بەڵام دواتر لەگەڵ بەرەو پێشچوونی بیر و هزری مرۆڤ جل و بەرگ داهات و بەشێک لە جەستەیان داپۆشی، ئێستا ئەوەی من دەیکەم بە دوا ئاستی زانست و بەرەو پێشچوونی دەزانم کە تەواوی جەستەم داپۆشیووە، نەک دواکەتن! هەرچی ڕووتی و نیشاندانی جەستەیە، مێژووەکەی بۆ سەدەکانی سەرەتا دەگەڕێتەوە، ئەگەر ڕووتیش پێشکەوتن بێت، ئەوا ئاژەڵەکان پێشکەوتووترینی مەخلوقاتن!!!

## • چەند وەڵامێکی دەمکوتکەری ئەبو حەنیفە

چەند کەسێکی بێ باوەڕ دەچنە لای ئەبو حەنیفە و دەیانەوێ بەچەند پرسیارێک ئیحراجی بکەن و شەرمەزاری بکەن.

یەکێک لەو بێ باوەڕانە لێی پرسی:

- خودای لە ساڵی چەندەوە هەیە؟

- ئەبو حەنیفە: خودا بەر لە هەبوونی کات و مێژوو هەبووە.

- ئەبو حەنیفە: پێش چوار چەندە؟

- وتیان: سێ.

- ئەبو حەنیفە: ئەی پێش سێ؟

- وتیان: دوو.

- ئەبو حەنیفە: ئەی پێش دوو چەندە؟

- وتیان: یەک.

- ئەبو حەنیفە: ئەی پێش یەک چەندە؟

- وتیان: هیچ شتێک پێش یەک نیە.
ئینجا ئەبو حەنیفە وتی:
- ئەگەر ژمارەیەکی حیسابی کە یەکە هیچ شتێکی لە پێشەوە نەیەت، چۆن تاکێکی حەقیقی کە (الله)یە شتێک لە پێشیەوە دێت؟ بەڵکو ئەو بەر لەبوون هەبووە!
ئینجا ئەوان پرسیان:
- خودای تۆ ڕوو دەکاتە چ ئاڕاستەیەک؟
- وتی: ئەگەر چرایەک لە شوێنێکی تاریک دابنێن، ڕووناکی و تیشکەکەی بۆ کوێ دەچێت؟
- وتیان: بۆ هەموو دەوروبەری.
- وتی: جا کە نور و ڕووناکیەکی دەستکرد بەو شێوەیە بێت، دەبێت حاڵی نور و ڕووناکی ئەو چۆن بێت؟
- وتیان: شتکێمان لەسەر خودای خۆت پێبڵێ؟ ئایە ئەو وەکو ئاسن ڕەقە؟ یان وەکو ئاو شلە؟ یانیش گازییە و وەکو دوکەڵ و تەم و بوخارە؟
- ئایا وا ڕێک کەوتووە کە لای کەسێک دانیشبتن لە کاتێکدا ئەو لەسەرە مەرگ بووبێت؟؟
- وتیان: بەڵێ، دانیشتووین.
- ئەبو حەنیفە: ئایا دوای مردنی هیچ قسەیەکی لەگەڵ ئێوەدا کرد؟
- وتیان: نەخێر.
- وتی: ئایا بەر لە مردنی جوڵە و قسەی دەکرد؟

- وتیان: بەڵێ، هەم جوڵە هەمیش قسەی دەکرد.
- وتی: ئەی چ شتێک ئەوی گۆڕی؟
- وتیان: دەرچوونی ڕوحی؟
- وتی: بۆ ڕوحی دەرچوو؟
- وتیان: بەڵێ.
- وتی: دەی کەوایە تۆزێک لەو ڕوحەم بۆ وەسف بکەن، چۆن بوو؟ ئایا وەک ئاسن ڕەق بوو، یان وەک ئاو شل بوو، یان گازی بوو وەک دوکەڵ و تەم و بوخار؟
- وتیان: شتێک دەربارەی چۆنیەتیەکەی نازانین!
- ئەبو حەنیفە: ئەگەر ئێوە نەتوانن وەسفی دروستکراو و مەخلوقێک لە مەخلوقاتی الله بکەن، چۆن داوا لە من دەکەن کە وەسفی خالقتان بۆ بکەم؟!
هیچ قسەیەکیان نەما و خۆیان بێ دەنگ کرد.

- **ئەی مەی (ئارەق)یش لە ترێ دروست نەکراوە؟**

نەسڕانیەک لە ماڵەکەی خۆیدا پێشوازی لە موسڵمانێک دەکات...
دوای هەواڵ پرسین و چاک و چۆنی یەکتر کردن، نەسڕانیەکە بڕێک ترێی هێنا و خستیە بەردەمی پیاوە موسڵمانەکە....ئەویش بسم الله لێکرد و کەمێکی لێ خوارد...
دواتر دوو کوپ شەڕاب (مەی) هێنا خستیە بەردەمی موسڵمانەکە و پێی وت:

- فەرموو بیخۆرەوە!!
ئەویش وتی :
- ئێمە ئەوە ناخۆینەوە، چونکە لە ئایینی ئێمەدا حەرام کراوە.
- نەسرانیەکە وتی: بەڕاستی ئێوە سەیرن ئەی موسڵمانینە، ترێ دەخۆن و لاتان حەڵاڵە، کەچی مەی ناخۆنەوە و دەڵێن حەرامە، لەکاتێدا ئەو شەڕابە هەر لەو ترێیە دروستکراوە کە لاتان حەڵاڵە!!!
موسڵمانەکە وتی:
- ئایا هاوسەرت هەیە؟
- نەسڕانی: بەڵێ.
- موسڵمانەکە: دەتوانی بانگی بکەیت؟
- ئەویش بانگی کرد...دواتر موسڵمانەکە لێی پرسی ئایا کچت هەیە؟
- نەسڕانی: بەڵێ.
- موسڵمان: دەتوانی ئەویش بانگ بکەیت؟
- نەسڕانی: بەدڵنیایی...ئەویشی بانگ کرد.
ئینجا موسڵمانەکە وتی:
- ئایا دەبینی کە هاوسەرەکەت حەڵاڵە بۆت، لەهەمان کاتدا کچەکەت لێ حەڕام کراوە؟؟؟ لەکاتێکدا کچەکەت هەر لەو هاوسەرەت لەدایک بووە!
نەسڕانیەکە وتی: (أَشْهدُ أَنْ لاَ إِله إِلاَّ الله، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله).

## • بەهای ئافرەت لە ئیسلامدا

لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفیزیۆنیدا لەگەڵ زانایەکی ئاینی، لە یەکێک لە کەناڵە ئەمەریکیەکان، پێشکەشکارەکە، لە زاناکەی پرسی:

- بۆچی ڕێگەنادەن ئافرەتەکانتان شۆفێری بکەن؟؟

- شێخەکە: ئایا سەرۆکی ئەمەریکا کاتێک کە گەنج بوو خۆی شۆفێری نەدەکرد؟

- پێشکەشکارەکە، با بەڵێ.

- شێخ: ئەی ئێستا، لەوەتەی بووە بە سەرۆک شۆفێری دەکات و ئۆتۆمبێل لێدەخورێت؟؟

- پێشکەشکار: نەخێر، تەنانەت ئەگەر ئارەزووش بکات، ناهێڵن و ڕێگری لێدەکەن.

- شێخ: بۆچی ؟

- پێشکەشکار: وەک ڕێزێک بۆی، هەروەها بەو شێوەیە زیاتر پارێزراوە؟

- شێخ: ئێمەش بەهەمان شێوە، کاتێک ڕێگری لە ئافرەتەکانمان دەکەین و ناهێڵین شۆفێری بکەن، ئەوە بۆئەوەیە کە پارێزراو بن و لەهەمان کاتیشدا وەک ڕێزگرتنێکە! بەمەش ئەوەی ئێوە بۆ سەرۆکەکەتانی دەکەن، ئەوا هەر یەک لە ئێمە بۆ خوشک و دایک و خێزانەکەی دەکات!

• شیعە لەسەردەمی پێغەمبەریش هەر بەو شێوەیە بوون!!
ئەم چیرۆکە لەسەردەمی شا، لە ئێران ڕوویداوە.
دەگێڕنەوە کە شا ویستویەتی گفتوگۆیەک لە نێوان سوننە و شیعە دروست بکات، بۆ ئەو مەبەستەش بانگهێشتی چەند زانایەکی لە هەردوو مەزهەبەکە کرد، بەو ئامانجەی لێک تێگەیشتن و لێک نزیک بوونەوەیەک لە بەینیان دروست بکات...
زانا شیعەکان هەرچی بانگهێشت کرابوو هەموویان ئامادەبوون، بەڵام لە سوننەکان تەنها یەک زانا ئامادە دەبێت ئەویش بە درەنگەوە دێتە هۆڵەکە(وتراوە کە ئەو تاکە زانایەش شێخ ئەحمەد دیدات بووە).
کاتێک هاتە هۆڵەکە بینیان هەر دوو پێڵاوەکەی بە بن پیلی خۆی هەڵگرتووە و بەرەو شوێنی دانیشتنەکەی دەچێت!
ئەوانیش دوای پێکەنینێکی گاڵتەجاڕیانە پێیان وت:
- ئەوە بۆ پێڵاوەکانت هێناوەتە ژوورەوە؟
ئەویش لەسەرخۆ وەڵامی دانەوە و وتی:
- من گوێم لێبووە کە شیعەکان لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) پێڵاوی خەڵکیان دزیووە!
ئەوانیش لە قاقای پێکەنینیاندا و وتیان:
- جا کوا لەسەردەمی پێغەمبەر شیعە هەبووە؟

- وتی: کەواتە گفتوگۆکە کۆتایی هات!! مادام لەسەردەمی پێغەمبەر (صل الله علیه وسلم) شیعە نەبووە، ئەی ئێوە ئەو دینەتان لە کوێ هیناوە؟ (1).

## • تەمبەڵی

لە بەحری کوڕی ئەحنەفی کوڕی قەیسیان پرسی:

- چی ڕێگرە لەوەی کە وەکو باوکت بیت؟

- وتی: تەمبەڵی.

## لە توانای تۆدایە

پیاوێک کە جل و بەرگێکی شڕ و دڕاوی لەبەردابوو لای ئەسکەندەر زۆر بە بەلاغەت و لۆژیکانە قسەی دەکرد...

ئەسکەندەر پێی وت:

- خۆزگە جلەکانیشت وەک وتەکان ڕێک و جوان دەبوون.

ئەویش زۆر بەخێرایی وەڵامی دایەوە و وتی:

- وتەکانم خۆم توانام هەیە بەسەریاندا، بەڵام جلەکانم تۆ دەتوانی بیانگۆڕیت و جوانیان بکەیت!

## • مشتومڕی شێخێک لەگەڵ بەشیری ڕۆمی

گەنجێکی ڕۆمی بەدیل دەگیرێ -کە گەنجێکی زۆر جوان بوو- کاتێک گەیشتە دار الإسلام خەلیفە بردیە لای خۆی -کە ئەو کات

---

(1) وتراوە کەسە سوننییەکە شێخ أحمد دیدات بووە.

سەردەمی خەلافەتی بەنی ئومەیە بوو- هەر ئەویش ناوی لەو لاوە دەنێ بەشیر، داوای لێکرد کە قورئان بخوێنێت، ئەویش بەماوەیەکی کەم فێری بوو و بەردەوام دەیخوێند، هەروەها فەرموودەیەکی زۆری وەرگرت و شیعرێکی زۆری خوێندەوە و لەبەرکرد.

بەڵام کاتێک کەمێک پێگەیشت، شەیتان هاتە لای و وەسوەسە و گومانی لا دروست کرد و پێی وت: تۆ بۆ هەڵگەڕاویتەوە لەسەر ئاینی باب و باپیرانت؟ لە کاتێکدا ئەوان لەسەر ئاینی نەسرانیەت بوون، بۆیە ئەویش بەو گومانانە دووچاری هەڵگەڕانەوە دەبێت و دار الإسلام جێ دەهێڵێت و هەڵدێت، بەرەو وڵاتی ڕۆم دەگەڕێتەوە، ئەوانیش هەر زوو پێشوازیان لێکرد و لێیان پرسی:

- چۆن موسڵمان بوویت، دوای ئەو هەموو زانست و زانیارییە؟

- ئەویش وەڵامی دانەوە کە بە حەز و ئارەزووی خۆی ئاینی ئیسلامی جێهێشتووە و ئاینی نەسرانی بە حەق و ئەولاتر زانیوە.

بەم وەڵامەشی لای پادشای ڕۆم خۆی خۆشەویست کرد، پادشاش کردی بە یەکێک لەکەسە دیار و نزیکەکانی، هەروەها چەندین زەوی و زاری بەرفراوان و گەورەشی پێبەخشی کە ئێستا بەناوی (دێیەکانی بەشیر) ناو دەبرێن.

قەزا و قەدەری خودا وابوو کە سی (٣٠) موسڵمان لەلایەن وڵاتی ڕۆمەوە بەدیل دەگیرێن، دواتر هەموویان هێنان بۆ لای بەشیر، ئەویش تاکە تاکە لە ئاینەکەی دەپرسین، لەنێو دیلەکانیشدا شێخێکی تێدا بوو، کە خەڵکی دیمەشق بوو پێیان دەووت: (واصل).

بەشیر پرسیاری لەویش کرد، بەڵام ئەو نکوڵی لەوە کرد کە وەڵامی بەشیر بداتەوە، ئینجا بەشیر پێی وت:

- بۆچی وەڵامم نادەیتەوە؟ بەیانی جارێکی تر پرسیارت لێدەکەمەوە، دەبێت وەڵامم بدەیتەوە، پاشانیش ئازادت دەکەم.

کاتێک ڕۆژ بووەوە، بەشیر هەر زوو بانگهێشتی شێخەکەی کرد و بە شێخەکەی وت:

- سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە بەر لە هەمووشتێک هەبوو، هەر حەوت ئاسمانەکەی دورست کردووە بێ ئەوەی یارمەتی هیچ کام لە دروستکراوەکانی لەگەڵ دابێت، هەروەها حەوت چینی زەوی دروست کرد بێ ئەوەی یارمەتی هیچ کام لە دروستکراوەکانی لەگەڵ دابێت، بەڵام سەیر لە ئێوە دایە ئەی عەرەبیینە کاتێک دەڵێن: ((بەڕاستی نموونەی دروست بوونی عیسا لەلایەن خواوە وەک نموونەی ئادەم وایە کە لە خاک دروستی کرد و لەوەودوا فەرمانی داو پێی وت: ببە (بە ئینسان) ئەویش بوو)).

شێخەکەش بێ دەنگ بوو.

- بەشیر: بۆچی وەڵامم نادەیتەوە؟

- شێخ: چۆن وەڵامت بدەمەوە لە کاتێکدا من دیلم لەبەر دەستی تۆ؟؟ ئەگەر وەڵامی تۆ بدەمەوە دەبێت بە دڵی تۆ قسەبکەم، بەمەش پەروەردگار لێم توڕە دەبێت، بۆیە دەبێت بەڵێنێکم پێ بدەیت کە لەسەر وەڵامەکانم غەدر و ستەمم لێنەکەیت و ئەوشتەش کە حەقە دانی پێدا بنێی.

- بەشیر: باشە بەڵێن بێت ستەمت لێنەکەم، بەڵێنیش بێت کە دان بە ڕاستیەکان دابنێم.

- شێخ: ئەوەی لە وەسفی پەروەردگادا وتت زۆر ڕاست و تەواو بوو، زۆر جوانیش وەسفت کرد، خودای گەورەش زۆر لەوە گەورەترە کە تۆ وەسفت کرد، چونکە هیچ کەسێک ناتوانێ حەقی وەسفی پەروەردگار بدات، بەڵام ئەوەی سەبارەت بە (ئادەم و عیسی) (علیهما السلام) وتت، بەڕاستی وەسفکردنێکی خراپ بوو، ئایا ئەوان دوو دروستکراوی خودا نەبوون؟ نەیان دەخوارد و نەیان دەخواردەوە؟ سەرئاویان نەبوو؟ نەدەخەوتن؟ هەڵنەدەستان؟ دڵخۆش نەدەبوون؟ دڵتەنگ نەدەبوون؟

- بەشیر: بەڵێ بە دڵنیاییەوە.

- شێخ: کەواتە بۆ جیاوازیت لە نێوانیاندا کرد؟

- بەشیر: چونکە عیسی دوو ڕوحی هەبوو، ڕوحێک کەڕو گەڕی پێ چاک دەکردنەوە؟ ڕوحێکیش غەیبی پێ دەزانی، کە هەموو شتێکی پەنهانی بە هۆی ئەو ڕوحە دەزانی...

- شێخ: دوو گیان (روح) لە یەک جەستەدا؟

- بەشیر: بەڵێ.

- شێخ: ئایا ڕوحە لاوازەکەی شوێنی ڕوحە بەهێزەکەی پێ دەزانی؟

- بەشیر: خودا بتکوژێ، ئەگەر بڵێم پێی دەزانی چی دەڵێی؟ ئەگەر بڵێم نا چی دەڵێی؟

- شێخ: ئەگەر بڵێی پێی دەزانی، ئەوا ئەوکات دەڵێم: بۆچی ڕوحە بەهێزەکە لاوازەکەی وەدەرنەدەنا؟ ئەگەر بشڵێی: نا، ئەوا دەڵێم: چۆن غەیب دەزانێت لە کاتێک نازانێت کە ڕوحێکی تری لە جەستەیدا هەیە....بەشیر بێ دەنگ بوو.

- شێخ: سوێندت دەدەم بەخودا، ئایا ئێوە لەبەر ئەوە خاچ دەپەرستن چونکە وا گومان دەبەن کە عیسی لە خاچدراوە؟

- بەشیر: بەڵێ.

- شێخ: بە ڕەزامەندی خۆی، یاخود خۆی پێی ڕازی نیە؟

- بەشیر: ئەمە وەکو پرسیاری پێشووە، ئەگەر بڵێم بە ڕەزامەندی ئەو چی دەڵێیت؟ ئەگەر بڵێم بە ڕەزامەندی ئەو نیە چی دەڵێی؟

- شێخ: ئەگەر بڵێی بەڕەزامەندی ئەوە، ئەوا دەڵێم: چۆن زانیتان پێی ڕازییە دوای مردنی، ئەگەر بشڵێی: خۆی پێی ڕازی نیە ئەوا دەڵێم: بۆچی کارێک دەکەن کە ئەو نایەوێ و لەسەرخۆی حەرامی کردووە؟

- بەشیر: سوێند بە خوا کەسێکی وەک تۆی زمان پاراو و زمانزان بۆ ئەوە باشە کە ببیت بە نەسڕانی. من خاوەنی شمشێرم، بەڵام بەیانی کەسێکت دەخەمە بەرامبەر کە خودای گەورە لەسەر دەستی ئەو سوک و ڕیسوات دەکات...دواتریش دەرفەتیدا کە بڕوات...

کاتێک بەیانی داهات بەشیر هاتە لای شێخ، بەڵام ئەمجارە قەشەیەکی زیرەک و لێهاتووی نێو ئایینی نەسڕانی لەگەڵ خۆی هێنابوو، کە ڕیشێکی درێژی هەبوو.

بەشیر بە قەشەکەی وت:

- ئەو پیاوە لە نەتەوەی عەرەبە، قسەی لەگەڵ بکە تا دەیکەی بە نەسرانی، ئەو کەسێکی ژیر و خاوەن عەقڵە، بۆیە ئارەزووی ئەوە دەکەم کە بێتە ناو ئایینەکەمانەوە...دواتر بەشیر سوژدەیەکی بۆ قەشەکە برد.

- قەشەکە: من تەنها بۆ کاری خێر هاتوومە، ئەوەش باشترین شتە کە من دەیکەم.

- قەشەکە ڕووی کردە شێخەکە و وتی: ئەی شێخ تۆ لەو کەسە بە تەمەنانە نیت کە مێشکیان لە دەست داوە و ژیریان نەماوە، نە هێندەش بچوکی کە عەقڵت جێگیر نەبووبێت و بالغ نەبووبیت، بەیانی دەتخەمە نێو مەعمودیە و لە ئاوت هەڵدەکێشم، دواتر دەتهێنمە دەرەوە و وەک کەسێکت لێدێت کە تازە لە دایک بووبێت...هیچ گوناهێکت پێوە نامێنێ!

- شێخ: ئەو مەعمودیە چییە؟

- قەشە: ئاوێکی پیرۆزە.

- شێخ: کێ پیرۆزی کردووە؟

- قەشە: من و قەشەکانی پێشوو پیرۆزمان کردووە.

- شێخ: ئایا تۆ گوناە و تاوانت نەبوو، یان قەشەکانی پێش تۆ هیچ تاوانێکیان نەکردووە؟ ئایا ئێوە مەعسووم و بێ گوناە و تاوان و کەم وکورتین؟؟

- قەشە: بەڵێ ئێمەش کەم و کورتیمان هەیە، تاکێک کە بێ کەم و کورتی بێت تەنها خودایە.

- شێخ: ئایا ئاو بەکەسێک پیرۆز دەکرێ کە خۆی پیرۆز و پاک نەبێت؟

قەشەکە بێ دەنگ بوو، کەمێک بیری کردەوە.

- قەشەکە: من پیرۆزم نەکردووە..

- شێخ: ئەی کەواتە چیرۆک و بەسەرهاتەکە چۆنە؟

- قەشە: ئەوە سوننەتی پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەمە.

- شێخ: کەواتە ئەو کارە چۆن بووە؟

- قەشە: یەحیای کوڕی زەکەریا عیسای خستۆتە نێو ئەو ئاوە، سەری پێشووشتووە و نزای بەرەکەت و خێری بەسەردا کردووە؟

- شێخ: ئایا عیسا پێویستی بە یەحیای کوڕی زەکەریا بوو بۆ ئەوەی پاکی بکاتەوە و نزای بەرەکەتی بۆ بکات؟ کەواتە شوێن یەحیا بکەون، چونکە ئەو لە عیسا باشترە...جارێکی تر بێ دەنگ بوو....بەشیر لەسەر جێگاکەی خۆی هەستا و دەستی کرد بە پێکەنین!

بەشیر بە قەشەکەی وت:

- هەستە خودا ڕیسوات بکات.

دواتر ئەو دەنگ و باسە گەیشتە لای پادشا، پادشاش بەدوای ئەو شێخەیدا نارد و بردیان بۆ لای.

- پادشا: تۆ چ چێژێک لەوە وەردەگری کە باس لە کەم و کورتی ئایینەکەی من دەکەیت و دەپڕژێیە سەری؟

- شێخ: من لەسەر ئایینەکەی خۆم بێدەنگ بووم، بەڵام کاتێک پرسیارم لێدەکەن وەڵامیان دەدەمەوە، چونکە پێم وایە ئایینی ئێمە حەق و تەواو و بێ کەم و کورتیە!

- پادشا: ئایا هیچ بەڵگەیەکت لەسەر ئەوە هەیە؟

- شێخ: هەر کەسێک ئارەزووی دەکەیت بانگهێشتی بکە با گفتوگۆم لەگەڵدا بکات، ئەگەر حەق و ڕاستی لای من بوو ئەوا هیچی تر سەرزەنشتم مەکە و گلەییم لێ مەکە، ئەگەر حەقیش لای ئەو بوو ئەوا من بەلای حەقەکەدا دەچم.

پادشاش گەورە پیاوی نەسرانییەکانی بانگهێشت کرد، کاتێک هاتە ژوورەوە پادشا و هەرچی لەوێش بوو کڕنۆشیان بۆ برد.

- شێخ: جەنابی پادشا ئەوە کێیە؟

- پادشا: گەورەی نەسرانیەکانە، کە نەسرانیەکان ئایین لەو وەردەگرن!!!

- شێخ: ئێوە هەرکەسێک وەکو ئادەمی بنوێ و هەڵبستێ و بچێتە سەر ئاو و بخوا و بخواتەوە ئەوا ڕقتان لێی دەبێتەوە و لاتان پاک نیە، کەچی گومانی ئەوە دەکەن کە پەروەردگار لە نێو سکی تاریکدا نیشتەجێ بووە و چۆتە ئەو ڕەحمە تەسکەوە و دواتریش هاتۆتە دەرەوە (پەنا بەخوا)؟!

ئایا ئێستاش لاتان وایە کە عیسی خودایە؟ یان ئەگەر بڵێن کوڕی خوداشە، ئایا دەکرێ کوڕی خودا بەو جۆرە بێتە دونیا؟(پەنا بەخوا).
قەشە گەورەکە لەئاست ئەو پرسیارانە دەمکوت و بێ وەڵام بوو...دواتر وتی:
- جەنابی پادشا، من پێم باشە ئەو شێخە ببەین بۆ کەنیسەی گەورە، بۆ لای قەشەکان، چونکە هەر کەسێک بچێتە ئەوێ ئەوا بە دڵنیایی دەبێتە نەصرانی.
- پادشا: باشە کەواتە بابیبەن بۆ ئەوێ.
- شێخ: بۆچی دەمبەن بۆ ئەو کەنیسەیە؟
- پادشا: مەترسە، هیچ شتێک زیانت پێناگەیەنێ، چونکە ئەوێ ماڵێکە لە ماڵەکانی خودا و یادی خودای تۆی تێدا دەکرێ و دەتوانی لەوێدا خوداپەرستی خۆت بکەی...
- شێخ: ئەگەر وابێت کێشە نیە دێم.
شێخیان برد بۆ کەنیسە، هەر کە گەیشتنە ئەوێ، پەنجەی خستە گوێچکەکانی و دەستی کرد بە بانگ دان، ئەوانیش زۆر بەمە توڕە بوون و هاواریان بەسەردا کرد و یەخەیان گرتوو و بردیان بۆ لای پادشا.
- قەشە: ئەی پادشا، ئەوە بەدەستی خۆی کوشتنی بۆ خۆی حەڵاڵ کرد.
- شێخ: ئەی پادشا، منیان بردە کوێ؟

- پادشا: تۆیان بردە ئەو شوێنەی کە دەتوانی خودای خۆتی تێدا بپەرستی.

- شێخ: ئێ منیش کەچوومە ئەوێ یادی خودام کرد و بانگم دا، هیچی ترم نەکردووە، جا ئەگەر هەرکات لە کەنیسەکانی ئێوە یادی خودا بکرێ ئێوە پێی بچوک بکرێنەوە، ئەوا بەڕاستی ئەوە کەم و کورتیەکی گەورەیە بۆ ئایینی ئێوە!

- پادشا: ئەو ڕاست دەکات، ئێوە چی دەڵێن؟

- قەشەکان: ئەی پادشا تەنها ئێمە بە کوشتنی ئەو ڕازی دەبین و لێی خۆش دەبین.

- شێخ: ئەگەر ئێوە من بکوژن، دواتر هەواڵ بگاتە خەلیفەی ئێمە ئەوا بەدڵنیایی تۆڵەتان لێدەکاتەوە و قەشەکانتان دەکوژێت و کەنیسەکانتان لێ وێران دەکات و خاچەکانتان دەشکێنێ؟

- قەشەکان: هەر بەڕاستی ئەو کارە دەکات؟

شێخ: گومانتان لەوە نەبێت کە ئەو کارە دەکات، بۆیە وازیان لێهێنا.

- شێخ: جەنابی پادشا، ئەهلی کتاب بەچ شتێک لەسەرەوەی ئەهلی بت پەرستانن؟ واتە بە چ شتێک ڕێزدارن؟

- پادشا: چونکە ئەهلی بت پەرستان خۆیان بتیان بخۆیان دروست دەکرد و دەیان پەرست، بەمەش ڕیسوا بوون و لەناوچوون.

- شێخ: جەنابی پادشا، ئێوەش وا خەریکە بە دەستی خۆتان خۆتان لەناو دەبەن، خۆتان ئەو خاچانەتان دروست کردووە و دەیانپەرستن، ئەگەر ئەوەی ئێوە دەیپەرستن لە ئینجیلدا هەیە ئەوا

من قسەیەکم نیە، بەڵام ئەگەر نیە بۆچی خۆتان بە ئەهلی خاچ پەرستان دەچوێنن؟
- پادشا: زۆر ڕاستە، ها قەشەکان، ئایا ئەو خاچ پەرستنە لە ئینجیلدا هاتووە؟
- قەشەکان: نا.
- پادشا: ئەی کەوایە بۆچی ئایینی خۆمان بە ئایینی بت پەرستان دەچوێنن؟؟
ئینجا قەشەکان وتیان: بەڕاستی جەنابی پادشا ئەو پیاوە یەکێکە لە شەیتانەکانی عەرەب، دەریا لەگەڵ خۆی هێناوە بۆ ئەوەی ئایینەکەی ئێمە سوک بکات، تکایە بینێرەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێهاتووە، نابێت خوێنی ئەو شەیتانە لێرە بڕژێ، ئەگەرنا زەویەکەشمان پیس دەکات...ئەو گەڕایەوە بۆ دیمەشق و پادشاش قەشەکانی سوک و ڕیسوا کردن و بەشێکیشی لێ کوشتن...

- **بۆ لەوە تێناگەی کە دەووترێت؟**

دوو پیاو مشتومڕیان بوو، یەکێکیان بەوەی تریانی دەوت:
- بۆچی بە جۆرێک قسە ناکەیت کە لێت تێبگەم؟
- ئەویش وەڵامی دایەوە و وتی: بۆچی لەوە تێناگەیت کە دەیڵێم؟

- **ئەبوجەعفەر و فەزڵی کوڕی ڕەبیع**

ئەبوجەعفەری مەنصور بە فەزڵی کوڕی ڕەبیعی وت:
- ئای ژیان چەند خۆشدەبوو ئەگەر مردن نەبوایە!!

- فەزڵ: قەسەم بەخوا ئەی ئەبو جەعفەر ئەم دونیایە تەنها بەمردنەوە خۆشبووە!!
- ئەبو جەعفەر: بۆچی؟
- فەزڵ: چونکە ئەگەر مردن نەبوایە تۆ بەو مەقامە نەدەگەیشتی!!

## • لە قوتابخانەدا چیت زۆر لا خۆشە؟

مامۆستایەک لە یەکێک لە قوتابیە تەمبەڵەکانی پرسی:
- لە قوتابخانەدا چ شتێک زۆر دڵخۆشت دەکات؟؟
- قوتابییەکەش وتی: زەنگ لێدانەکانی!!

## • گفتوگۆی پیاوێک و پزیشکێکی دەروونی.

- پزیشک: کێشەت چییە بەڕێزم؟
- پیاوەکە: هیلاکی و سەرقاڵی.
- پزیشک: کارەکەت چییە بەڕێزم؟
- پیاوەکە: ژمێریارم لە بانک.
- پزیشک: ئەی هاوسەرەکەت چ کارێک دەکات؟
- پیاوەکە: هیچ کارێک ناکات، تەنها ماڵ بەڕێوە دەبات.
- پزیشک: کێ تۆ و منداڵەکان لە خەو هەڵدەستێنێ و خواردنی بەیانیتان بۆ ئامادە دەکات؟
- پیاوەکە: هاوسەرەکەم، چونکە هیچ کارێک ناکات.
- پزیشک: هاوسەرەکەت کەی لەخەو هەڵدەستێ و تۆش کاتژمێر چەند؟

- پیاوەکە: کاتژمێر پێنجی بەیانی هاوسەرەکەم لەخەو هەڵدەستێت، منیش کاتژمێر حەوت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەو منداڵەکان ئامادە دەکات بۆ قوتابخانە...

- پزیشک: کێ منداڵەکان دەگەیەنێتە قوتابخانە؟

- پیاوەکە: هاوسەرەکەم، چونکە ئەو کارێکی ئەوتۆی نیە.

- پزیشک: دوای ئەوەی هاوسەرەکەت منداڵەکان دەبات بۆ قوتابخانە چی دەکات، تۆش چی دەکەیت؟

- پیاوەکە: دێتەوە و خواردن بۆمنیش ئامادە دەکات، دواتریش جلە پیسەکان دەشوات و ماڵ پاک دەکاتەوە..دواتریش چاوەڕێی منداڵەکان دەکات تا دێنەوە، چونکە ئەو بێ کارە و هیچ کارێکی نیە...!!منیش دەچمە سەرکارەکەم تا کاتژمێر ٣ی پاش نیوەڕۆ!

- پزیشک: باشە بەڕێزم دوای ئەوەی لە کار دەگەڕێیتەوە چی دەکەیت؟ هاوسەرەکەشت چی دەکات؟

- پیاوەکە: دوای نان خواردن کەمێک پشوو دەدەم، هاوسەرەکەشم وانە بە منداڵەکانمان دەڵێتەوە و یارمەتیان دەدات، دواتریش چایەک ئامادە دەکات و من لە خەو هەڵدەستێنێ و بەیەکەوە دەیخۆینەوە!!

- پزیشک: ئەی دوای ئەوە تۆ و هاوسەرەکەت چی دەکەن؟

- پیاوەکە: من ڕۆژنامە دەخوێنمەوە و هەندێکیش سەیری تەلەفیزیۆن دەکەم، هاوسەرەکەشم دەست دەکات بە ئامادەکردنی نانی ئێوارە، دواتریش کەل و پەلەکان دەشوات و ناو ماڵ پاک دەکاتەوە...

پزیشک: ئێستا!! کام لە ئێوە پێویستی بە نەخۆشی دەروونی هەیە؟ تۆ یان هاوسەرەکەت؟ کامەتان پێویستیتان بە پشوو هەیە؟

## • کەی خودا کوێری کردی؟

ڕۆژێکیان پیاوێک دەچێت بۆ حەمامێک، بەر لەوەی بگاتە شوێنی خۆشوشتن لە حەمامەکە خۆی ڕوت دەکاتەوە، لەو کاتەشدا ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خودای لێبێت) چاوی دەکەوێتە سەر و هەر زوو چاوی خۆی دادەخات، کابراش دەڵێت:

- ئەوە لەکەیەوە خوای گەورە کوێری کردووی؟

- ئەبو حەنیفەش دەڵێ: لەو کاتەوەی کە تۆ خۆت ڕیسوا کردووە.

## • منداڵێکی ژیر و خەلیفە

وەفدێک دەچێتە لای خەلیفە هیشامی کوڕی عبدالملک بۆئەوەی حاڵ و گوزەرانی خۆیانی بۆ باس بکەن کە چۆن هەژاری تەنگی پێهەڵچنیون، بەڵام خەلیفە باوەڕی بەقسەکانیان نەکرد و هیچی پێنەدان...

لەناکاو منداڵێک لەنێو وەفدەکە هاتە دەنگ و وتی:

- ئەی خەلیفە: ئەگەر ئەو سەروەت و سامانەی لاتە هی پەروەردگارە ئەوا بەسەر بەندەکانیدا دابەش بکە، ئەگەر هی خۆشتە ئەوا خێرمان پێبکە، ئەگەر هی خۆشمانە بۆ لێمان زەوت دەکەیت؟؟

خەلیفە زۆر بەوتەی ئەو منداڵە کاریگەر بوو...دواتر وتی:

ژنە شاعیرێک هاتە لای موتەوەکیل و باسی شاعیریەتی خۆی لا کرد، موتەوەکیلیش ئەبو عەینای ڕاسپارد بۆ ئەوەی تاقی بکاتەوە...
ئەبو عەینا بە ژنە شاعیرەکەی وت:
- تۆ خۆت پێ شاعیرە؟
- ئەویش وتی: بەڵێ.
- ئەبو عەینا وتی: کەواتە من نیوە دێرێک دەڵێم تۆ تەواوی بکە...
- ژنەکەش وتی فەرموو...
- ئەبو عەینا: الحمد لله كثيرا
- ژنەکەش بۆی تەواو کرد و وتی: حيث أنشأك ضريرا

## • حەزدەکەیت ژنەکەت بمرێ؟

لە دەشتەکیان پرسی:
- حەزدەکەیت ژنەکەت بمرێت.
- وتی: نا.
- وتیان: بۆ؟
- وتی: ئاخر دەترسم لە خۆشیان بمرم.

• بۆچی ئێوەش نانووسن؟؟

لە یەکێک لە کۆنفراسەکان لە وڵاتی میسر، ئەو گفتوگۆیەی خوارەوە لەنێوان دوو مامۆستای زانکۆدا ڕوویدا، کە یەکێکیان خەڵکی وڵاتی مەغریب بوو، ئەوەی تریشیان میسری.

- مامۆستا میسرییەکە: ئەی مامۆستایانی وڵاتی مەغریب بۆ ئێوەش شتێک نانووسن تاوەکی خەڵکی بیخوێننەوە؟؟ (بێگومان ئەو قسەیەی وەک گاڵتە پێکردنێک بوو بۆ مامۆستایانی ئەو وڵاتە، مەبەستی ئەوە بوو کە ئەوان هیچ نانووسن).

مامۆستا مەغریبییەکەش زۆر لەسەرخۆ و بەهێمنی وتی:

- بەڕێزم ئێمە زیاتر سەرقاڵی ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵانەین کە نووسەرانی وڵاتانی تر لە نووسین و داهێنانەکانیاندا ئەنجامی دەدەن، هەر بۆیەش فریای نووسین ناکەوین (مەبەستی وڵاتی میسڕ بوو).

دوای ئەو وەڵامە مامۆستا میسڕییەکە بێدەنگ بوو و تەنانەت وشەیەکی تریشی نەدرکاند...

• تۆ کامیان هەڵدەبژێری؟؟

حەجاج چەند چەند کەسێکی لە خەواریجەکان دەستگیرکردبوو، هەروەها حوکمی کوشتنیشی بۆ هەموانی دەرکربوو، بەڵام بەر

لەوەی حوکمەکەی جێبەجێ بکرێت ئافرەتێک هاتە لای و داوای لە حەجاج کرد کە بەزەیی هەبێت و مێرد و برا و کوڕەکەی ئازاد بکات.
دوای چەند خولەکێک لە قسەکردنیان.
حەجاج ڕازی بوو کە یەکێک لەو کەسانە ڕزگار بکات بۆ ئەو مەبەستەش بە ئافرەتەکەی وت:
- باشە لەبەرخاتری تۆ تەنها یەکێک لەو کەسانەت ڕزگار دەکەم، جا خۆت سەرپشک بە و یەکێکیان هەڵبژێرە.
- ئافرەتەکەش زۆر دانایانە وتی: مێر دەست دەکەوێتەوە، کوڕ دروست دەبێتەوە، بەڵام برا نایەتەوە (چونکە ئەو ئافرەتە دایک باوکی نەمابوو)، بۆیە براکەی هەڵبژارد.
حەجاج بە دانایی ئەو ئافرەتە زۆر سەرسام بوو، بۆیە بڕیاریدا کە هەرسێکیان ئازاد بکات.

• **فلان پێت پێدەکەنێ!!**

ئەبو عەینا یەکێکە لەو کەسانەی کە بە وەڵامی خێرا و وتەی ناوازە ناسراوە، هەمیشە وەڵامی خێرا و دەم کوتکەری بۆ بەرامبەری پێبووە...
ڕۆژێکیان پیاوێک دێتە لای و پێی دەڵێ:
- فلانە کەس هەمیشە پێت پێدەکەنێ..
ئەویش هیچ خۆی تێک نەدا و وتی:
- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ﴾ [المطففين: ٢٩].

واته: بێگومان ئەوانەی کە تاوانیان دەکرد گاڵتەیان بە ئیمانداران دەهات و پێیان پێدەکەنین.

• وەڵامی نووسەرێکی ئەمەریکی بۆ نووسەرێکی فەڕەنسی

جارێکیان نووسەری فەڕەنسی (پۆل بورجییە) لەیەکێک لە نووسینەکانی گاڵتە بە ئەمەریکیەکان دەکات و دەنووسێت:

- کەسی ئەمەریکی ئەو کاتەی کەمێک بوار و دەرفەتی دەبێت ئینجا بە دوای ڕەچەڵەک و نەژادیدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی بیاندۆزێتەوە...

کاتێک نووسەری ئەمەریکی (مارک تووین) ئەو نووسینە دەخوێنێتەوە، وەڵامی (پۆل) دەداتەوە و دەنووسێت:

- ئەو ڕاست دەکات...بەڵام کەسی فەڕەنسی هەموو کاتەکەی بۆ ئەوە تەرخان دەکات تابزانێ کێ باوکیەتی.

• وەڵامی خاوەنی کۆمپانیای جەنەڕاڵ مۆتۆرز بۆ خاوەنی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت

"بیل جیتس" لە میانەی بەشداریکردنی لە پێشانگایەکی تایبەت بە کۆمپیوتەر دەڵێت:

- ئەگەر هاتبا و کۆمپانیای جەنەڕاڵ مۆتۆرزیش وەکو ئێمە لە پێشکەوتنی بەردەوام دابوایە ئەوا ئێستا:

نرخی ئۆتۆمبێلێک تەنها (٢٥) دۆلار دەبوو.

جەلیکانێک بەنزین بەشی هەزار کیلۆ مەتری دەکرد...

بەڵام هەر زوو بەڕێوەبەری کۆمپانیای جەنەڕاڵ مۆتۆرز وەڵامی "بیل"ی دایەوە و وتی:

- ئەگەر هاتبا و ئەو کۆمپانیایەی تۆ دەیڵێی هاوشێوەی مایکرۆسۆفت گەشەی کردبا و پێشکەوتبا، ئەوا ئێستا ئۆتۆمبێلەکانی ئەو کۆمپانیایەمان بەو شێوەی خوارەوە دەبینی:

- ڕۆژانە ئۆتۆمبێلەکانی دوو جار تێکدەچوون و پەکیان دەکەوت...بەبێ هیچ هۆکارێکی دیاریکراو...

کاتێکیش پەکی دەکەوت، بە شۆفێر دەوترا بڕۆ سەرشۆستە بوەستە...جامەکانت دابخە...جارێکی تر ئۆتۆمبێلەکەت بەکاربخەوە..دواتر گشت جامەکان بکەرەوە...(وەک توانجێک لە کۆمپیوتەرەکانی ئەو سەردەمە).

- لە جیاتی نیشانەی بەنزین و حەماوە و عەقلی ئۆتۆمبێل ئەو دەستەواژەی خوارەت دەبینی "ئۆتۆمبێلەکەت کارێکی هەڵەی ئەنجامداوە بۆیە بیکوژێنەوە".

- لەکاتی ڕووداوێکی پێکداداندا بە شۆفێر دەوترا: " ئایا تۆ دڵنیایت لەوەی کە دەتەوێ پەڕەشووت بەکاربهێنی؟" ئەگەر دەتەوێت بەکاری بهێنی پەنجە لەسەر (بەڵێ) دابگرە...دوای داگرتنی بەڵێ جارێکی تر پێت دەووترا: " ئایا تۆ دڵنیایی لەوەی کە دەتەوێت بەکاری بهێنی؟"

بەمەش "بیل" بێ دەنگ بوو و چیتری نەووت.

- **نێردەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) و مەقۆقس**

ئەو کاتەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) نێردەی خۆی ناردە لای مەقۆقس لە ئەسکەندەریە بۆ ئەوەی پەیامی ئیسلامەتی پێبگەیەنێت، ئەم گفتوگۆیە زۆر جوان و ژیرانە لە نێوان نێردەکە و مەقۆقسدا ڕوویدا، ئەمەش بەشێکە لە گفتوگۆکە:

- مەقۆقس: ئایا تۆ ناڵێی کە موحەممەد پێغەمبەری خودایە و، خوداش خۆی دەیپارێزێت و چاودێری دەکات؟

- نێردەکە: با، بەڵێ.

- مەقۆقس: ئەی بۆچی لەتاریکە شەو لە مەککە ڕادەکات و ئەو شارە جێدەهێڵێت؟ (مەبەستی ئەوەبوو کە بۆچی خودای گەورە نەیپاراست مادام پێغەمبەری ئەوە).

- نێردەکە: ئەی جەنابی پادشا، تۆ باوەڕت بە نەسرانیەت هەیە وایە؟

- مەقۆقس: بەڵێ.

- نێردەکە: ئایا تۆ ناڵێی کە عیسا (علیه السلام) کوڕی خودایە؟؟

- مەقۆقس: با، بەڵێ.

- نێردەکە: ئەی چۆن باوکی کە خودایە ڕێگەیدا کە یەهوودییەکان لە خاچی بدەن؟؟

مەقۆقس: زۆر سەرسام بوو بە وەڵامەکەی و تەنها ئەوەی بۆمایەوە کە بڵێ:

- دانایەک لەلای دانایەکەوە هاتووە!!

بۆیە وتراوە: گەر کەسێکت نارد بۆ لای کەسێک، ئەوا کەسێکی ژیر و دانا بنێرە.

## • عەقڵ و سامان و ئارامگری

یەکێک لە شای فارسەکان لەسەر دەگاکەی نووسیبوو:

- " لە دەرگادانی ماڵی پادشاکان پێویستی بە عەقڵ و سامان و ئارامگری هەیە"

کەسێکی داناش ئەو نووسینەی بینی و چوو لەژێریەوە نووسی:

- "هەر کەسێک تەنها یەکێک لەو سێ شتەی هەبێت ئەوا پێویستی بە لە دەرگادانی ماڵی پادشاکان نابێت"

ئەو هەواڵە گەیشتە لای پادشاکە و ئەویش بڕیاریدا کە نووسینەکە لەسەر دەگاکەی لابدات و داناکەشی خەڵات کرد.

## • ئایا لە دوای قورئان هیچ بەلاغەتێک ماوە؟

جارێکیان ئەصمەعی شاعیر بە وتەی ئافرەتێک سەرسام دەبێت و دەڵێت:

- بە خودا قسەکانت زۆر جوانن و پڕن لە دانایی و بەلاغەت!

- ئافرەتەکەش وتی: ئایا لە دوای قورئانی پیرۆز هیچ بەلاغەتێک ماوە؟ لە کاتێکدا تەنها لەیەک ئایەتدا دوو فەرمانی نەهی و دوو بەشارەت و مژدەی تێدایە.

- ئەصمەعی وتی: توخوا ئەگەر ئەو ئایەتەم بۆنەخوێنیەوە (واتە بۆم بخوێنەوە).

ئەویش وتی ئەو ئایەتەیە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ [القصص: ٧].

ئەصمەعی زۆر بە زانستی ئەو ئافرەتە سەرسام دەبێت و دادەمێنێ.

- بەرەو کوێ دەچی ئەی هامان؟

جارێکیان عبدالله ی کوڕی خازم بە یەکێک لە کەسەکانی نزیک خۆی دەڵێت:

- ها ئەوە بۆ کوێ دەچی ئەی هامان؟

کابراش هەر زوو وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت:

- دەچم بورجێکت بۆ دروست دەکەم.

عبدالله زۆر بەو وەڵامە سەرسام بوو، چونکە ئەگەر کابرا هامان بێت ئەویش فیرعەونە.

- تەمەنی من چەندە؟

یەکێک لە ژنە ئوستۆقراتیەکان لە برناردشۆ دەپرسێت:

- "تەمەنی من بە چەند هەڵدەسەنگێنی"

برناردشۆش سەیرێکی کرد و کەمێکی بیرکردەوە...پاشان وتی:

- ئەگەر بە گوێرەی سپیەتی ددانەکانت و درەوشانەوەیان بێت، ئەوا تەمەنت تەنها (١٨) ساڵە.
ئەگەر بە گوێرەی ڕەنگی پرچیشت بێت ئەوا دەتوانم بڵێم تەمەنت تەنها (١٩) ساڵە.
ئەگەر بە گوێرەی ڕەفتارەکانیشت هەڵت سەنگێنم ئەوا دەتوانم بڵێم تەمەنت تەنها (٢٠) ساڵە.
ئەو هەڵسەنگاندنە زۆر دڵی ژنەکەی خۆشکرد..دواتر ژنەکە بە برناردشۆی وت:
- سوپاس بۆ ئەو هەڵسەنگاندنە جوانەت، بەڵام ئەگەر بە ڕاستی هەڵم بسەنگێنیت پێت وایە تەمەنم چەندە؟
برناردشۆش یەکسەر وتی: هەر سێکیان کۆبکەرەوە: ١٨+١٩+٢٠=
بەمەش ژنەکە خۆشیەکەی لێ تێکچوو و بەدڵتەنگی برناردشۆی جێهێشت.

## • دەڵێی دایکی شیری پێداوە

جارێکیان دەشتەکیەک ئامادەی خوانی خەلیفەیەک دەبێت، ئەوانیش بەرخێکی برژاوی دەخەنە بەردەم، دەشتەکیەکەش زۆر بەخێرایی و بەچێژەوە دەست دەکات بە خواردنی ئەو بەرخە.
خەلیفە پێی دەڵێت:
- بۆ بەم شێوەیە ئەو بەرخە دەخۆی دەڵێی دایکی جەرگی تۆی بڕیوە و ئازاری داوی؟
- دەشتەکیەکەش بە خێرایی وەڵامی خەلیفە دەداتەوە و دەڵێت:

- جا تۆ بۆ بەزەیت پێیدا دێتەوە، دەڵێی دایکی شیری پێت داوە!
بەمەش خەلیفە بێ دەنگ بوو.

## • تۆ بێ ئاگای یان گەمژەیت؟

دوو کەسی هەرزەکار بەلای پیاوێکی دانادا ڕۆیشتن و ویستیان گاڵتەی پێ بکەن، یەکێکیان چووە لای دەستی ڕاستی و ئەوەی تریان چووە دەستە چەپی، پاشان پێیان وت:
تۆ بێ ئاگایت یان گەمژەیت؟
ئەویش زۆر بەهێمنی وتی:
- من لە نێوان هەردووکیانم.

## • ئایا بەرد ملی هەیە؟؟

کەسێک بە شەعبی وت:
- ئایا ڕاستە ئەگەر بەردەکانی موزدەلیفە ببەیت بەردەکان هاوار دەکەن تا دەیانگەڕێنیتەوە شوێنی خۆیان؟
شەعبیش وتی:
- لێیان گەڕێ با هەر هاوار بکەن تا ملیان دەقرتێ؟
پرسیارکەر زۆر بە سەرسامیەوە وتی:
- سبحان الله، واتا ملیشیان پێوەیە؟؟
- شەعبیش وتی: ئەی ئەگەر ملیان نەبێت چۆن هاوار دەکەن؟!

## • ماڵ و منداڵت چۆنە؟

ڕۆژێکیان یەکێک لە حوکمڕانە نەسڕانیەکان لە ئاهەنگێکدا هەموو ڕاوێژکار و وەزیر و گەورە ڕاهیبەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی لە کۆشک کۆکردنەوە، بۆ ئەوەی بەیەکەوە چەند ساتێکی خۆش بەسەرببەن.

ئەبوبەکر باقلانیش ئەوە بە دەرفەتێک دەزانێت بۆ ئەوەی بچێت لەو شوێنە بانگەوازی خودا بکات و ئیقامە حوجەی سەرجەم بەشداربوانی ئەو ئاهەنگە بکات و بیروباوەڕی ڕاستیان بۆ ڕوون بکاتەوە.

هەر کە چووە ژوورەوە، ڕووی کردە گەورەی ڕاهیبەکان و پێی وت:

- جەنابی ڕاهیب ماڵ و منداڵت چۆنە؟

ئەوانەی لەوێ بوون هەموویان واقیان وڕمابوو! تا پادشا بە قسە هات و وتی:

- بەسە بێ دەنگ بە، تۆ ئاگات لەخۆتە کە چی دەڵێی؟ کوا ڕاهیبەکان ژن دەهێنن تاوەکو منداڵیان هەبێت؟ ئەوان بە دوورن لەو شتە، لەوە پاکترن کە منداڵیان هەبێت؟

ئەویش ئەو وەڵامەی پادشای بە هەل زانی و وتی:

- وای لە ئێوە، کوڕ و نەوە بۆ خودا بڕیار دەدەن، کەچی دەڵێن ڕاهیبەکان لەوە پاکترن کە منداڵیان هەبێت!

هەمووان بەو وەڵامەی باقلانی دەمکوت بوون و نوقەیان لێوە نەهات.

## سوودی شکستەکان لە چییە؟

"ئەدیسۆن" دوای ئەوەی لە سەد هەوڵدا شکستی هێنا، بەڵام ئەو هەر بەردەوام بوو.

کاتێکیش لێیان پرسی:

- بۆچی هێندە سووری لە سەر هەوڵەکانت؟ سوودی ئەو هەموو هەوڵانەت چییە؟

- وتی: سەد هەوڵمدا، تیایدا سەرکەوتوو نەبووم، بەڵام ئێستا ئەوە دەزانم کە ئەو سەد ڕێگایە نامگەیەنێتە ئامانج و منیش جارێکی تر ئەو هەوڵە هەڵانە دووبارە ناکەمەوە...ئەوەیە سوودی هەوڵەکان!

## قورئانییەک و کابرای تازە موسڵمانبوو

کەسێکی بێباوەڕ دوای ئەوە زۆرشت دەربارەی ئیسلام دەخوێنێتەوە و دڵی بەرەو ئیسلامبوون دەچێت، تەنها هەندێک پرسیاری سادەی ماوە.

ڕۆژێکیان دەچێت بۆ لای کەسێکی موسڵمان تاوەکو وەڵامی ئەو چەند پرسیارەشی وەربگرێتەوە کە لە زیهنیدا ماون، بەڵام ئەو کەسە باوەڕی بە فەرموودە نابێت و پێی وایە دەبێت ئایین تەنها لە قورئان وەربگیرێت و پشت بە هیچ سەرچاوەیەکی تر نەبەسترێ...هەر زووش ئامۆژگاری ئەو پیاوە دەکات کە ئەگەر هاتوو موسڵمانبوو

تەنها و تەنها پشت بە قورئان ببەستێت و بۆ هەر شتێک تەنها بەڵگەی قورئان وەربگرێت و هیچی ترنا.

کابرا دوای ئەوەی وەڵامی ئەو چەند پرسیارەشی وەردەگرێتەوە و گومانی نامێنێ ڕوو دەکاتە کابرای قورئانی و دەڵێ:

- ئێستا دەمەوێ موسڵمان بم!! پێمبڵێ پێویستە چی بکەم؟؟

- کابرای قورئانی: پێویستە هەردوو شەهادەکە لە دوای من بڵێیەوە!!

- کابرا: واتا چی بڵێم؟؟

- کابرای قورئانی: بڵێ: (أشْهدُ أنْ لاَ إله إلاَّ الله، وَأنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله).

- کابرا: خۆت فێرت کردم کە بۆ هەر شتێک تەنها داوای بەڵگەی قورئانی پیرۆز بکەم، کەواتە بەڵگەی قورئان لەسەر ئەوە چییە کە من پێویستە ئەو دوو شەهادەیە بڵێمەوە؟؟

- کابرای قورئانی: ئێستاشی لەگەڵ بێ بە دوای بەڵگەیەکی قورئانەوەیە بۆ ئەو بابەتە.....!!

- **تەنها حەرفێک زیاد بکە!**

گەنجێک لە ڕێگادا بە ئەبو علای ئەلموعەری دەگات و ئەو گفتوگۆیە لە نێوانیاندا ڕوودەدات:

- گەنجەکە: تۆ کێی ئەی پیاو؟

- ئەبو عەلا: من ئەبو عەلای شاعیرم.

- گەنجەکە: ئەبو عەلای شاعیری بەناوبانگ و دیار؟؟

- ئەبو عەلا: بەڵێ.

- گەنجەکە: کەواتە تۆ خاوەنی ئەو دێرە هۆنراوەیت کە دەڵێ:

**وإنی وإن کنت الأخیر زمانه　　　لآت بما لم تستطعه الآوائل**

واتە: (ئەگەرچی لە کۆتا زەمانیشم، بەڵام شتگەلێک دههێنم کە خەڵکانی پێش من نەیانتوانیوە بیکەن و بیهێنن).

- گەنجەکە: ئێستاش تۆ دەڵێی لە توانام دایە کە شتێک دابهێنم کە کەسانی پێشوو نەیانتوانیوە دایبهێنن و ئەنجامی بدەن؟

- ئەبو عەلا: بە دڵنیاییەوە بەڵێ.

- گەنجەکە: زانایانی پێشوو ٢٨ پیتیان بۆ زمانی عەرەبی داناوە، تۆ تەنها ١ پیت بۆ ئەو ٢٨ پیتە زیاد بکە....ئایا دەتوانی تەنها یەک پیت زیاد بکەیت؟

ئەبو عەلا بێدەنگ بوو...دواتر وتی:

قەسەم بەخوا هەرگیز وەکو ئەمجارە بێ دەنگ نەکراوم!

- **بۆچی هێندە باس لە داهاتوو دەکەیت؟؟**

لە زانا "شارلز کترنگ"یان پرسی:

- بۆچی هێندە باس لە داهاتوو دەکەیت؟

- وتی: چونکە ئەو ژیانەی ماومە لەوێدا بەسەری دەبەم!

- **دیاری پادشاکان زۆر گرانبەهان**

ڕۆژێکیان والی حیجاز بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت، لە ڕێگادا چاوی کەوت بە "ئەشعەب" کە ئەوکات منداڵ بوو، ئەویش پێی وت:

- هۆی لاوە، خوێندەواریت هەیە؟؟

- ئەشعەبیش وتی: بەڵێ، قوربان.
- والی: دەی کەوایە شتێکم بۆ بڵێ یان بۆم بخوێنەوە؟؟
- ئەویش ئایەتی یەکەمی سورەتی (الفتح) بۆ خوێندەوە: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾ [الفتح: ١].
- والی کاتێک ئەوەی لە ئەشعەب گوێ لێبوو زۆر دڵی پێخۆشبوو، دەستی برد بۆ گیرفانی و دینارێکی دەرهێنا بە ئەشعەبی وت:
- ها بیگرە ئەو دینارە بۆ تۆ، لە پاداشتی ئەو خوێندنەوەیەت.
ئەشعەبیش دینارەکەی ڕەت کردەوە و وەری نەگرت.
- والی وتی: بۆ ڕەتت کردەوە، بۆ وەریناگری؟
- ئەشعەب: ئاخر ئەگەر وەری بگرم باوکم لێم دەدا.
- والی: نا نا لێت نادات، بڵێ ئەوە والی پێیدام.
- ئەشعەب: ئاخر دەزانم باوەڕم پێناکات کە تۆ ئەو پارەیەت داومەتێ..
- والی: بۆ؟
- ئەشعەب: چونکە دینارێک هیچ نیە، پادشا و والیەکان پارەی زۆر و دیاری گرانبەها دەبەخشن! ئەگەر لای باوکم بڵێم والی تەنها یەک دیناری داومەتێ، ئەوا باوەڕ ناکات.
والی زۆر پێی سەرسام بوو و چیتر نەدوا...

* ژنی ئیبلیس ناوی چییه؟

له شه‌عبیان پرسی:

- ژنی ئیبلیس ناوی چییه؟

وتی: والله نازانم، ئه‌و ڕۆژه‌ی ژنی ماره‌کرد نه‌چووبووم!!

* گوێبیستی هه‌موو زانست بوویت؟

ڕۆژێکیان گه‌نجێک لای شه‌عبی باسی بابه‌تێکی ده‌کرد.

شه‌عبیش وتی:

- من گوێم له شتی وانه‌بووه!!

گه‌نجه‌که‌ش وتی:

- ئایا تۆ گوێبیستی هه‌موو زانستێک بوویت؟

- ئه‌ویش وتی: نا.

گه‌نجه‌که جارێکی تر وتی:

- ئایا گوێبیستی نیوه‌ی هه‌موو زانستێک بوویت؟

- شه‌عبی: نه‌خێر.

- گه‌نجه: جا ئه‌و بابه‌ته‌ی من باسی ده‌که‌م وایدانێ که له‌و به‌شه‌یه که گوێبیستی نه‌بوویت!

شه‌عبی بێ ده‌نگ بوو و هیچی نه‌وت.

- **وامزانی تۆ بەئاگایت**

پیرەژنێک هاتە لای سوڵتان سلێمانی قانونی و سکاڵای ئەوەی لاکرد کە سەربازەکانی هاتوونەتە نێو مەڕ و ماڵاتەکەی و چەند دانەیەکیان لێ دزیوە.

سوڵتانیش وتی:

- پێویستە کە شەونخونیان بەدیارەوە بکەیت و ئاگاداریان بیت و نەخەوی، تاوەکو کەس نەتوانێ بیاندزێت.

پیرەژنەکەش وتی: زۆر چاکە جەنابی سوڵتان، گومانم برد کە سوڵتان پارێزەری ناوچەکەیە و بە ئاگایە لە هەر ڕوداوێک، لەمەودوا خۆم چاودێریان دەکەم.

بەم وتانە سوڵتان زۆر هەستی بە شەرمەزاری کرد و سەری دانواند.

- **کەواتە مێشکیشت لە دەرەوە جێبهێڵە!**

لەیەکێک لە بەرنامە تەلەفیزیۆنییەکان کە تایبەت بوو بە پرسیاری شەرعی، پیاوێکی لە وڵاتی یەمەنەمەوە پەیوەندی دەکات دەپرسێت:

- ئەی شێخ من کاتێک دەچمە سەرئاو موبایلەکەشم لەگەڵ خۆم دەبەم، ناو موبایلەکەشم تەواوی قورئانی پیرۆزی تێدا خەزن کراوە، ئایا ئەوەی من دەیکەم دروستە؟

- شێخ: هیچ کێشەیەکی تێدانیە.

- پیاوەکە: بەڵام شێخ موبایلەکە قورئانی تێدایە؟!

- شێخ: برای بەڕێزم هیچ کێشەیەکی تێدانیە و تاوانبار نابی، چونکە ئەوە لەناو میمۆرییەکەدا خەزن کراوە.

- پیاوەکە: ئاخر شێخ چۆن دەبێت قورئانی تێدا بێت و ببیەتە سەرئاوەوە؟ (ئەو حەزی دەکرد شێخەکە بڵێ جائز نیە، بۆیە زۆر دوپاتی دەکردەوە)؟

شێخەکە زانی بەو جۆرە قەناعەتی نایە، بۆیە ئەمجارە بە شێوازێکی تر لەگەڵی دوا.

- وتی: باشە براکەم تۆ هیچ قورئانت لەبەرە؟

- پیاوەکە: بەڵێ، جەنابی شێخ زۆریشم لەبەرە.

- شێخ: زۆر باشە، ئەمجارە کەچویتە سەرئاو مێشکت لە دەرەوە جێ بهێڵە! بەمە کابرا بێ دەنگ بوو و تەلەفونەکەی داخست.

- **وەڵامێکی دەمکوتککەری ئەبو عەلا**

ئەستێرە ناسێک و پزیشکێک دێنە لای شاعیر و فەیلەسوف ئەبو عەلای ئەلموعەری، باسی ئیمان و مردن و زیندوو بوونەوەی لا دەکەن، دەڵێن:

- لامان سەیرە کە تۆ کەسێکی ئاوا تێگەیشتوو و پێگەیشتووی باوەڕت وایە کە مرۆڤ دوای مردن جارێکی تر زیندوو دەکرێتەوە و جەستەکەی گیانی بەبەر دادێتەوە و حەشر دەکرێ...بەڕاستی لامان سەیرە ئەو دونیا خۆشە بەو بیروباوەڕە تەسکە بەسەر ببەیت!

موعەریش زۆر بە جوانی بە دوو دێرە شیعر وەلامی دانەوە و دەمکوتی کردن و وتی:

قالَ المُنَجِّمُ وَالطَبيبُ كِلاهمـا
لا تُحشَرُ الأجسادُ قُلتُ إلَيكمـا
إن صَحَّ قَولُكُما فَلَستُ بِخاسِـرٍ
أو صَحَّ قَولي فَالخُسارُ عَلَيكُما

واتە: ئەستێرەناس و پزیشکەکە هەردووکیان وتیان
جەستەکان حەشر ناکرێن و منیش پێم وتن
ئەگەر وتەکەی ئێوە ڕاست بێت ئەوا من زەرەر بارنیم
ئەگەر قسەی منیش ڕاست بوو ئەوا ئەو کات تەنها ئێوە زەرەر مەندن
بێ دەنگ بوون و نوقەیان لێوە نەهات.

## • ئەندازیاری پاککەرەوە

ڕۆژێک منداڵێک بەپەلە لەدەرگای ماڵەکەیانەوە دێتە ژوورەوە و دەڵێت:

- باوکە پیاوی خۆڵەکە هات خێرا باخۆڵەکە بەرینە دەرەوە (مەبەستی کارگوزارەکانی شارەوانی بوو!!!).

- باوکیشی وتی: کوری شیرینم خۆم لەڕاستیدا ئێمە پیاوی خۆڵەکەین، چونکە خۆڵەکە ەی ئێمەیە ئەو تەنها ئەندازیاری پاکەرەوەیە!!

## • UN ئیشی چیە؟

منالێک لە باوکی پرسی
- باوکە UN ئیشی چیە ؟
- باوکیشی وتی: خانووەکانمان دەڕوخێنن و خێمەمان دەدەنێ

## • بۆچی منت ڕزگار کرد؟

ڕۆژێکیان حەجاج بەرەو دەریا دەچێت و دەیەوێ خۆی فێنک بکاتەوە و کەمێک مەلەوانی بکات.
بەڵام کاتێک دەگاتە قوڵایی حەجاج ماندوو دەبێت و هەناسەکانی زۆر بە زەحمەت دەداتەوە.
لەو کاتەدا یەکێک لە زانا موسڵمانەکان بەوێدا ڕەت دەبێت و حەجاج لەو بارودۆخەدا دەبینێ، ئەو زانایەش بەوە ناسراوە کە زۆر دوژمنایەتی حەجاج دەکات.
ئەویش بەخێرایی جلەکانی دادەکەنێ و لەدژی شەپۆلەکان هەنگاو دەنێ و بەرەو حەجاج دەچێت.
دوای کەمێک توانی کە حەجاج ڕزگار بکات و بیگەیەنێتە کەناری دەریاکە.
کاتێک حەجاج بە ئاگا هاتەوە بینی ئەو کەسەی کە ڕزگاری کردووە یەکێکە لە دوژمنە سەرسەختەکانی و بەردەوام دژایەتی دەکات.
حەجاج بە دەنگێکی نزم و لەسەرخۆ وتی:

- دەڵێن: تۆ دوژمنایەتی من دەکەی، ئایا ئەوەی ئەوان دەیڵێن ڕاستە؟

- زاناکەش وتی: بەڵێ هەرچی وای وتبێت ڕاست دەکات.

- حەجاج بەسەرسامیەوە: ئەی کەوایە بۆ ڕزگارت کردم و نەتهێشت بخنکێم؟!

- زاناکە: قەسەم بەخوا لە خۆشەویستیم بۆ تۆ تۆم ڕزگار نەکردووە، بەڵکو تەنها لەوە ترسام کە بەشەهیدی بمریت و دواتریش بچیتە بەهەشت، هەر لەبەر ئەوە ڕزگارم کردی!

## • ژیانی تۆ وابەستەی ژیانی منە

یەکێک لە پادشاکان ئەستێرەناسێک بانگهێشتی کۆشکەکەی دەکات و پێی دەڵێ:

- بیستومە کە تۆ بانگەشەی ئەوە دەکەیت کە گوایە زانستی پەنهان و غەیب دەزانی، دەزانی کە چی دەگوزەرێ و چی ڕوو دەدات، دەبێ ئێستا توانای خۆتم لەو بوارەدا نیشان بدەیت (پادشاکە لەناخی خۆیدا نیەتی خراپی بەرامبەر بەو ئەستێرەناسە هەبوو، دەیویست بیانوێکی پێبگرێت و دواتریش لە پەنجەرەی کۆشک بیخاتە خوارەوە و بیکوژێت!).

بەڵام ئەستێرەناسەکە هەر زوو نیەتی پادشای خوێندەوە و زانی کە پادشا نیەتی باشی لەو بانگهێشتکردنە نیە...بۆیە ویستی بە فێڵێک خۆی لە پادشا ڕزگار بکات، بۆ ئەو مەبەستەش وتی:

- پادشای ئازیز، با چەند زانیارییەکەت لەسەر ژیانی خۆت پێ بڵێم:

هەست دەکەم ژیانی من و تۆ زۆر لەیەکترەوە نزیکە!
زانیارییەکانی من پێم دەڵێن کە مردنی تۆش لە مردنی من نزیکە، دوو ڕۆژ دوای مردنی من تۆش دەمری! بۆیە هەرکات من مردم تۆش خۆت بۆ مردن ئامادە بکە!
کاتێک پادشا ئەو وتانەی لە ئەستێرەناسەکە بیست خۆی بێدەنگ کرد و دەستی بە گاڵتەکردن کرد لەگەڵی!
نەک هەر نەیکوشت بەڵکو پاسەوانیشی بۆ دانابوو بۆ ئەوەی هیچی بەسەر نەیەت!

- **ئەو دەفرە چی تێدایە؟**

ڕۆژێکیان منداڵێک دەفرێکی سەرداپۆشراوی پێیە و بەرەو یەکێک لە ماڵە دراوسێکانی دەچوو.
پیاوێکیش لەسەر ڕێگاکەی وەستابوو، ئەو پیاوە حەزی دەکرد کە باس و خواسی هەموو گەڕەک بزانێت.. لە منداڵەکەی پرسی:
- هێی کوڕە، ئەو دەفرە چی تێدایە؟
منداڵەکەش زۆر بەخێرایی وەڵامی دایەوە و وتی:
- ئەگەر دایکم ویستبای کە هەموو کەسێ بزانێت کە ئەو دەفرە چی تێدایە ئەوا سەری دانەدەپۆشی!

- **شێت نوێژی لەسەر نیە**

ڕۆژێکیان کەسێکی وەسواس دەچێت لە کۆڕی زانای بەناوبانگ ئیبن عەقیل دادەنیشێت و پرسیار لە ئیبن عەقیل دەکات و دەڵێت:

- من چەند جارێک خۆم لە ئاو هەلکێشا، بەلام لەگەل ئەوەشدا گومانم هەیە کە ئایا پاک بوومەوە یاخود نا، بۆچوونی جەنابتان چیە لەم بارەیەوە؟

ئیبن عەقیل وەلامی دایەوە و وتی:

- تۆ نوێژت لەسەر نیە!

کابرا ئەو وەلامەی زۆر لا سەیر بوو، وتی:

- چۆن؟

- ئیبن عەقیل پێی وت:

- چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ((رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّي يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الْغُلَامِ حَتَّي يَحْتَلِمَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّي يُفِيقَ)) واتە: ((خودای گەورە قەلەمی لە سەر سێ کەس هەلگرتووە ((واتە هیچیان لەسەر نیە) خەوتوو تاوەکو لە خەوەکەی هەلدەستێت، مندال تاوەکو بالغ دەبێت، شێت تاوەکو شێتیەکەی نامێنێ و بە هۆش دێتەوە)). جا هەر کەسێک چەند جارێک خۆی لە ئاو هەلبکێشێ - وەک تۆ- دواتریش گومانی هەبێت کە غوسلی لەسەر لاچووە یاخود نا، ئەوا بێگومان شێتە، بۆیە نوێژت لەسەر نیە.

## وەلامەکانی پەروەردگار بۆ بەندەکانی

**ئەگەر وتیان:**

**-بۆچی خودا بەمشێوەیە فلانە شتەی دروستکردووە؟**

-بۆچی وای بەسەر فلان هێنا؟

-بۆچی شەوی وا دروست نەکرد و شەو بەوشێوەیە؟؟

-بۆچی هەمووانی نەکردە موسڵمان؟؟

-بۆچی بەشێکیانی دەوڵەمەند کردووە و زۆرێک هەژار؟؟

-بۆچی ستەمکاران لەنێو نابات؟؟

-بۆچی...بۆچی...بۆچی...

-تەنها بە فەرمایشتی پەروەردگار وەڵامیان بدەوە و بڵێ: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴾ [الأنبياء: ٢٣] واتە: ((پرسیار ناکرێت لەوەی کە خوا دەیکات، لە کاتێکدا ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت و موحاسەبە دەکرێن)).

- ئەو وتی: زۆر بێزارم، تازە خودا لێم خۆشنابێت، چونکە تاوانێکی زۆرم ئەنجام داوە...

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ [الزمر: ٥٣]. واتە: ((ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: خوا دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم.. ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کردووە و هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی

ڕاست و دروست بکەن، خوا لەهەموو گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت، چونکە بێگومان ئەو خوایە زۆر لێخۆشبوو لێبوردەیە و زۆر بە سۆزو میهرەبانیشە)).

- ئەو وتی: من کەس شک نابەم و زۆر بێکەسم.

-پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ ....وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴾ [ق: ١٦] واتە: ((... ئێمە لەشاڕەگی دڵی لێی نزیکترین )).

- ئەو دەپاڕایەوە و دەی وت: خودایە لەیادم مەکە...

**پەروەردگار دەفەرموویت:** ﴿ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ ... ﴾ [البقرة: ١٥٢] واتە: (((ئەی ئیمانداران ئەگەر یادی من بکەن، ئەوا منیش یادی ئێوە دەکەم ...)).

- ئەو دەیووت من کەوتومەتە نێو ناخۆشیەکانەوە و تازە ڕزگاربوونم نیە...

**پەروەردگار دەفەرموویت:** ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴾ [الشرح: ٥] واتە: ((بەڕاستی هاوڕێ لەگەڵ تەنگانەدا خۆشی و ئاسوودەیی دێت)).

- یەکێکی تر دەیوت نازانم چۆن بگەم بە هیوا و ئاواتەکانم...

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ ... ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ ... ﴾ [غافر: ٦٠] واتە: ((ئێوە هاناو هاوار بۆ من بهێنن، ئەوا من دوعاو نزاتان گیرا دەکەم)).

یەکێکی تر بە دەست ئازارەکانی ژیانەوە دەیووت:

- ئارامم نەماوە و چیتر بەرگەی ئەم ژیانە ناگرم...

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ ... إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ [البقرة: ١٥٣] واتە: ((دڵنیابن کە خوا یارو یاوەری خۆگر و ئارامگرانە)).

- **بۆچی ئاو دەخۆینەوە؟**

پیاوێک بە گاڵتەپێکردنەوە لە هاوڕێکەی پرسی:

- بۆچی ئاو دەخۆینەوە؟

هاوڕێکەشی وتی:

- ئەی قابیلە بیخۆین..ئێ ئاو هەر دەخورێتەوە.

- **جگە لە خوا داوا لەکەسی تر ناکەم!!**

پادشایەک خواناسێکی بەبێ تاوانی خستە زیندانەوە، لە نیوەشەودا خەونێکی ناخۆشی بینی، هەربۆیە بڕیاریدا کە پیاوە خوانەسەکە ئازاد بکات...

کاتێک ئازادی کرد پادشا بە پیاوەکەی وت:

- چیت دەوێ بۆت بکەم لە بەرامبەر ئەوەی کە تۆم بە بێ تاوانی زیندان کرد؟؟

خوانەسەکە زۆر بە یەقینەوە وتی:

- من خودایەکەم هەیە کە لە نیوەشەودا پادشا بێدار دەکاتەوە بۆ ئەوەی بێت و من ئازاد بکات، جا چۆن جگە لەو داوای شت لە کەسێکی تر دەکەم؟؟!!

## • ئەمجارە دوای نانی ئێوارە لێی دەدەم

دایکێک بە کوڕەکەی وت:

- ئەمجارە لە خوشکەکەت بدەیت ناهێڵم نانی ئێوارە بخۆیت.

- کوڕەکە: باشە ئەمجارە دوای نانی ئێوارە لێی دەدەم.

## بەخوا وەکو باوکم دەکەم!!

گەنجێک دەچێت بۆ مزگەوت، کاتێک نوێژەکەی تەواو دەکات و دێتە دەرەوە دەبینێ کە پێلاوەکەی نەماوە و دزراوە...

ئەویش زۆر توڕە دەبێت و دەست بە هاوارکردن دەکات و دەڵێت:

- بەخوا ئەگەر ئەو پێڵاوانەم بۆ نەهێننەوە ئەوا وەکو باوکم دەکەم، باوکیشم پێشتر پێڵاوی لێ دزراوە، جا تکایە بیانهێنەوە...

دزەکە بەو هەڕەشانەی ئەو کوڕە زۆر ترسا، بۆیە پێڵاوەکانی هێنانەوە و وتی:

- بمبورە بەخوا زۆر داوای لێبوردن دەکەم...

ئەویش بەخشی و ویستی بڕوا...

- دزەکە: توخوا بەر لەوەی بڕۆی پێم بڵێ کاتێک پێڵاویان لە باوکت دزی چی کرد؟؟؟

- گەنجەکە: پێڵاوێکی تری کڕی!!!

### • ئاساترین ڕێگا

لە یەکێکیان پرسی ئاسانترین و بێ ماندووبونترین ڕێگا بۆ ئەوە پارچە ڕایەخێک لەژێر قاچی فیلێک بهێنینە دەرەوە چ ڕێگایەکە؟

- ئەویش وتی: چاوەڕێ بکەین تا فیلەکە دەڕوات!

### • پرسیاری گەمژەکان

یەکەم: کلکی ئەسپ چەند تاڵ مووی پێوەیە!

دووەم: ٩٦٥٢٣١٥٦٨٥٦٢٥٦٩٨٤

یەکەم: چۆن ئەوەت زانی؟

دووەم: ئەگەر باوەڕ بە من ناکەیت برۆ بیانژمێرە!

### • باوەڕ بە کەر دەکەیت و بەمنی ناکەیت؟

پیاوێکی ڕەزا قورس ویستی کەر لە مەلای مەشهور وەربگرێت و سەردانێکی شاری پێبکا...

مەلای مەشهوریش حەزی نەدەکرد کەرەکەی وێبدات، بۆیە وتی:

- بمبورە کەرەکەم لە ماڵ نیە!!

- پیاوەکە: چۆن لە ماڵ نیە، من تازە گوێم لە دەنگی بوو!!

- مەلای مەشهور: واتە باوەڕ بەکەرەکەم دەکەیت و باوەڕ بە من ناکەیت؟؟

• **وابزانە ڕۆیشتووە!!**

یەمامە دەڵێ:

- چومە لای هاوڕێیەکم، بەر لەوەی بچمە ژوورەوە کەرەکەم لەبەر دەرگا بەستەوە، کەسیشم لەگەڵ دانەبوو تاوەکو لای جێبهێڵم و بۆم بپارێزێ...

کاتێک چوومە دەرەوە بینیم منداڵێک لەسەر پشتی کەرەکەمە و پێدەکەنێ و کەیف خۆشە.

منیش خۆم لێتوڕە کرد و وتم:

- ئەوە بۆ سواری گوێدرێژەکەم بوین؟

ئەویش وەڵامی دامەوە و وتی:

- خاڵە گیان ویستم بۆت بپارێزم و نەڕوات.

- وتم: ڕۆیشتبا باشتر بوو لەوەی بەو شێوەیە لە شوێنی خۆی بێت!

- منداڵەکە: دە کەواتە وابزانە ڕۆیشتووە و بیدە بە من...منیش سوپاسێکت دەکەم...

سەرم داخست و نەمزانی چی بڵێم.

• **ئارەزووی چیت کرد بیخوێنە**

جارێکیان یەکێک لە حوکمڕانەکان لە دوای ئیمامێکەوە نوێژی دەکرد، ئیمامەکەش نوێژەکەی زۆر درێژکردەوە و حوکمڕانەکە زۆر پەست بووبوو...

کاتێک نوێژەکە تەواو بوو دەستی کرد بە پرتە و بۆڵە و بە ئیمامەکەی وت:

- بۆت نیە لەمەودوا لەیەک ئایەت زیاتر بخوێنی...

جا کاتێک کاتی نوێژی مەغریب هات و ئیمام پێشکەوت و دەستی کرد بە خوێندنی قورئان...

سورەتی فاتیحەی تەواو کرد و تەنها ئەو ئایەتەشی خوێند: ﴿ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾ [الأحزاب: ٦٧] واتە: (((هەروەها) دەڵێن: ئێمە ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاغاو گەورەکانمان بووین، هەر ئەوان ڕێگەو ڕێبازی (ڕاستیان) لە ئێمە شێوان و ون کرد)).

دواتریش لە ڕکاعەتی دووەم دوای فاتیحە ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴾ [الأحزاب: ٦٨] واتە: ((پەروەردگارا: دووبەرابەرو دوو چەندان بەرامبەر سزای ئەوان بدەو نەفرینێکی زۆر بێئەندازەیان لێ بکە)).

کاتێک حوکمڕانەکە گوێبیستی ئەو دوو ئایەتە بوو لە ترسان دەلەرزی، هەر کە نوێژەکە تەواو بوو بە ئیمامەکەی وت:

- جەنابی ئیمام ئارەزووی چیت کرد بیخوێنە، چەندت ویست بیخوێنە، جگە لەو دوو ئایەتەی ئێستا خوێندت!!

## • باشتر وایە ڕووت لای جلەکانت بێت

پیاوێک لە ئەبو حەنیفەی پرسی:

- ئەگەر بمەوێ لە ئاوی ڕووبار غوسل لەخۆم دەربکەم، چاکتر وایە ڕووم لە قیبلە بکەم یاخود پشتمی تێ بکەم؟؟

ئەبوحەنیفە وتی:

- باشترە ڕووت بکەیتە جلەکانت بۆ ئەوەی نەیاندزن!!

## • تا ئێسقانت بە دیار دەکەون

پیاوێک لە شەعبی دەپرسێ:

- ئایا دەکرێت لە کاتی ئیحرامدا پێستی خۆم بخورێنم؟؟؟

- شەعبیش وتی: بەڵێ، هیچ کێشەیەکی تێدانیە.

- پیاوەکە: تا چ ڕادەیەک بۆم هەیە بیخورێنم؟

- شەعبی: تا ئێسقانت بە دیار دەکەوێ!!

## • سوود وەرگرتن لە ساویلکەیی کەسانی تر

بایەکی توند هات و کەشتیەکەی خستە مەترسیەوە.

شەپۆلەکان تا دەهات گەورەتر و توندتر دەبوون.

سەرنشینەکان لە ترسی خنکان هەموویان پەشۆکابوون و هاواریان دەکرد.

تەنها یەکێکیان پالی بەستونێکەوە دابوو...زۆر بەئارامی دانیشتبوو. بەشێک لە سەرنشینەکان چوونە لای و لێیان پرسی:

ئایا تۆ لەوە ناترسی کە بخنکێیت؟؟
- وتی: نەخێر، چونکە من دوعایەک دەزانم کە لە خنکان ڕزگارم دەکات!!
- وتیان: ئەو دوعایە بۆ ئێمەش دەبێت؟
- وتی: بێگومان، بەڵام هەر یەکێکتان دەبێ دینارێکم پێ بدەن!
- وتیان: باشە، هەریەکە و دینارێکیان پێدا.
دواتر بە قەدەری خودا کەشتیەکە لەنگەری گرت و هەموویان ڕزگاریان بوو...یەکێک لەوانەی کە ئەو پیاوەی دەناسی پێی وت:
- ئایا تۆ لەوە نەترسای کە بە فیڵەکەت بزانن و تۆڵەت لێبکەنەوە؟
- ئەویش وتی: نەخێر هیچ نەترسام، چونکە ئەگەر خنکاباین هەموومان دەخنکاین و یەکترمان نەدەبینیەوە!

- **داگیرکەران وەکو گورگن؟**

بە جەمالەدینی ئەفغانیان وت:
- بەڕاستی داگیرکەران وەکو گورگ وان!! (مەبەستیان ئەوەبوو کە زۆر دڕندەن).
- ئەویش وتی: نا هەرگیز وانیە، بەڕاستی ئەگەر ئێوە وەکو مەڕنەبن هەرگیز ئەوانیش ناتوانن وەکو گورگ وابن!!

- **لەکێوە دانایی فێربووی؟**

لە لوقمانی حەکیمیانی پرسی:
- ئەو هەموو حیکمەت و داناییە لە کێ فێربووی؟

- وتی: له نەزانەکان، هەر کاتێک ئەوان هەڵەیەک یان کەموو کورتیەکەم لەوان دیبێ، من لێی دوورکەوتومەتەوە و خۆم لێپاراستووە.

- **کەم و کورتیەکە لە ئێمەوە بوو!**

ژن و مێردێک دوای بەسەربردنی چەند ساڵێک لە ژیانی کرێچیاتی دەبنە خاوەن خانوی خۆیان، زۆر بەدڵخۆشی و کامەرانیەوە دەچنە خانوەکەیانەوە.

دوای تێپەربوونی چەند ڕۆژێک بەیانیەک کە هەستان بۆ خواردنی نانی بەیانی ژنەکە لە پەنجەرەی ماڵەکەیەوە سەیرێکی خوارەوەی کرد بینی وا یەکێک لە ژنە دراوسێکانیان جل بە ڕستەی جل وشکردنەوە دەکات بۆ ئەوەی وشک ببنەوە، ژنەکە بە پیاوەکەی وت:

- سەیرکە ئازیزەکەم ژنی ئەو ماڵە چەند کەمتەرخە، ئەها جلەکانیان هێشتا چەند پیسن، دیارە نازانێ جل بشوات!

ئەم ڕستەیە چەند بەیانیەک دووبارە بوویەوە.

تا بەیانیەکیان ژنەکە هەستا و سەیری ماڵی دراوسێکەی کرد بینی ئەمجارە جلەکان زۆر پاک بوون، هەر زوو بانگی مێردەکەی کرد و وتی:

- ئازیزەکەم وەرە سەیربکە شوکر بۆ خوا ئەو ژنەی دراوسێمان فێری جل شوشتن بووە، ئەمڕۆ جلەکانی زۆر پاک شوشتوون!!

پیاوەکەش زۆر بەنەرم ونیانیەوە وتی:

- نا هاوسەری ئازیزم ئەم بەیانیە من زوو هەستام و شوشەی پەنجەرەکەی ماڵەکەمان پاککردەوە، ئەو پیسیەی هەموو رۆژێک دەمانبینی هی پەنجەرەکەی خۆمان بوو نەک هی جلەکانی ئەو ماڵە دراوسێیەمان!

ژنەکە داماو و زۆر پەشیمان بووەوە لەو گومانە خراپانەی کە بە ژنە دراوسێکەی بردبوون.

- **دونیا باڵندەیەکە و ئەندەلوسیش کلکەکەیەتی**

پیاوێک لە ئەندەلوسەوە دێتە لای هارونە ڕەشید...

هاوڕونە ڕەشیدیش بەو پیاوەی وت:

- دەڵێن: دونیا وەک باڵندەیەک وایە و ئەندەلوسیش کلکەکەیەتی...

پیاوە ئەندەلوسیەکەش بەخێرایی وتی:

بەڵێ ڕاست دەکەیت قوربان جا ئەو باڵندەیەی تۆ دەیڵێی تاوسە (ئاشکرایە کلکی تاوس زۆر جوانە، ئەو پیاوەش لە خۆشەویستی بۆ نیشتیمانەکەی تاوسی هەڵبژارد).

هارونە ڕەشید بە خێرایی و جوانی وەڵامی ئەو پیاوە لەلایەک و خۆشەویستی بۆ نیشتیمانەکەی زۆر سەرسام بوو!!!

- **بۆچی من؟**

"ئارسەر" یاریزانی بەناوبانگی تێنسی سەر زەوی دوای ئەوەی بە هۆکاری گواستنەوەی خوێنی پیس بۆی لە کاتی کرداری نەشتەرگەری دڵیدا توشی نەخۆشی کەمی بەرگری لەش(ئایدز) هات

جا بەر لەوەی بمری لەلایەن [illegible] نامەی هاوغەمی ودڵدانەوەی بۆ دەهات، لە یەکێک لەنامەکانی کە بۆی هاتبوو لەلایەن هاورێیەکیەوە تێیدا نوسرا بوو:

- " بۆچی خودا لە نێو چەندەها ملیار تۆی هەڵبژارد، تاوەکو بە دەست ئەو نەخۆشیە نەفرەتیەوە بناڵێنی؟".

لە وەڵامی ئەو نامەیەدا ئارسەر بۆ هاورێکەی نوسی:

- لە سەرتاپای جیهاندا (٥٠٠) ملیۆن منداڵ خولیای یاری تێنس بوون، لەوانەدا (٥٠) ملیۆن کەس توانی فێری بنەماکانی ئەم یاریە ببن، لەو ژمارەیەشدا تەنها (٥) ملیۆن کەس توانیان ببنە یاریزانێکی باوەڕ پێکراو، دواتر ٥٠ هەزار یاریزان توانیان بگەنە کێبرکێ، لەوانیش تەنها (٥) هەزار کەس توانیان کێبرکێ بکەن لەسەر بەدەست هێنانی پاڵەوانیەتی (جراند سلام) لە فەرەنسا، پاشان لەمانەش (٥٠) کەس توانیان بگەنە پاڵەوانیەتی ( ویمبلدون) لە بەریتانیا، دواتریش لەم (٥٠) کەسە چوار یاریزان توانیان بگەن بە یاری پێش کۆتایی لەم چوارەش دوو یاریزان چوون بۆ یاری کۆتایی دواتر لە یاری کۆتایش یەک پێشبڕکێکار توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت ئەو کەسەش من بووم، بەڵێ من بووم تونیم پلەی یەکەم بە دەست بهێنم و جامەکە بەدەست بهێنم، دوای ئەوەی کە جامی پاڵەوانیەتەکەم وەرگرت و بەرزم کردەوە لە خۆشیدا خەریک بوو باڵا بگرم...چەندین سەرکەوتنی تریش... لە هیچ لەم

سەرکەوتنانە نەم پرسی ( بۆچی من ئەی خودا)؟! دەتەوێ ئێستا بپرسم خودایە (بۆچی من؟).

ئێسکە ڕزیوەکان چۆن دەبنەوە بە مرۆڤ؟ ئەمە زۆر ئەستەکە!!

بێ باوەڕان هەر لە کۆنەوە ئینکاری زیندووبوونەوەی مرۆڤیان کردووە، پێیان وایە کە مرۆڤ دوای ئەوەی دەبێت بە ئێسک و پروسک و دەڕزێ هەرگیز جارێکی تر زیندوو نابێتەوە، دەڵێن: ﴿ ...مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ ﴾[یس: ٧٨] واتە: ((کێ دەتوانێ ئەو ئێسک و پروسکە رزیوانە زیندوو بکاتەوە؟)). قورئان وەڵامیان دەداتەوە و دەمکوتیان دەکات: ﴿ ... يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ ﴾[یس: ٧٩] واتە: ((پێیان بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کرد، هەر ئەویش زیندووی دەکاتەوە، ئەو بەهەموو دروستکراوێک زاناو ئاگایە (چونکە بەڕاستی دروستکردنەوەی شتێک کە ئەسڵێکی هەبووە زۆر ئاسانترە لەوەی کە شتێک پێشتر بوونی نەبووبێ ئینجا دروست بکرێت (پەروەردگاری مەزنیش بەهەر شتێک بڵێت ببە، ئەوا دەبێت))

- **من نوێنەرایەتی میللەتێکی برسی دەکەم!**

"غاندی" دەڵێت:

- ئەو کاتەی چوومە بەریتانیا، لەوێ ڕۆژنامەنووسێک بە گاڵتەجاڕییەوە لێی پرسیم:

- ئەوە چ جل و بەرگێکە لەبەرت کردووە، تەنانەت کەم و کورتی و عەیبی جەستەشتی دانەپۆشیووە، بۆ جلێکی تۆزێک ڕێکت نەپۆشیووە؟

منیش پێم وت:

- بەڕێزم، من نوێنەرایەتی میللەتێکی پرسی و ڕووت دەکەم بۆیە بەمشێوەیەم!

• **گەرمنیش ئەو نەبینم ئەوا ئەو من دەبینێ**

لە یەکێک لە کانگاکانی خەڵوز، منداڵێکی بچوک چاوەڕێی هاتنە خوارەوە مەسعەدی دەکرد، تاوەکو باوکە کرێکارەکەی بێتە خوارەوە و بەرەو ماڵ بڕۆنەوە.

یەکێک لەسەرپەرشتیارەکانی بینی و پرسیاری لێکرد:

- تۆ چی دەکەیت لێرە؟

منداڵەکە: من چاوەڕێی باوکم دەکەم.

- سەرپەرشتیار: ئاخر تۆ ناتوانی باوکت بناسیتەوە لە نێو ئەو هەموو پیاوەدا، چونکە هەموویان کڵاویان لەسەرەو هەروەها هەمووشیان بە خەڵوز ڕەنگی پێستیان ڕەش هەڵگەڕاوە، بۆیە وا باشترە بچیتەوە بۆ ماڵەوە.

بە تەواوی پاکی و بێگەردی خۆی وەڵامی دایەوە و وتی:

- بەڵام ئەگەر منیش ئەو نەناسمەوە ئەوا باوکم من دەناسێتەوە!

ئای چەند وەڵامێکی جوانە!

بەڵێ، ئەو دەزانێت کە ناتوانێت باوکی بناسێتەوە، بەڵام ئەوەش دەزانێت کە باوکی بە دڵنیاییەوە دەیناسێتەوە!

## • بۆچی ئیسلام لەسەر ئێمەی پێویست کردووە کە گوێڕایەڵی پیاوەکانمان بین؟

لە بەرنامەیەکی ئایینی تەلەفیزیۆنیدا ئافرەتێک پەیوەندی دەکات و دەپرسێت:

- ئەی شێخ بۆچی ئیسلام لەسەر ئێمەی فەرز کردووە کە دە بێت گوێڕایەڵ و خزمەتکاری پیاوەکانمان بین و لە قەسەیان دەرنەچین؟

- شێخ: خوشکی من تۆ چەند کوڕت هەیە؟؟

- ئافرەتەکە: سێ کوڕ

- شێخ: خودای گەورە فەرمانی بەهەرسێکیان کردووە کە خزمەتکاری تۆبن و لەقسەی تۆ دەرنەچن، تەنانەت ئەگەر تۆ لێیان ڕازی نەبیت چونە بەهەشتیشیان ئەستەمە...

ئافرەتەکە: دەستی کرد بە گریان و وتی: الحمدلله لەسەر نیعمەتی ئیسلام!!

## • تۆ بۆ من دووەم و سێیەم وچوارەمی!!

ژن و مێردێک بەیەکەوە قورئانیان دەخوێند.

لەو کاتەی کە ئافرەتەکە قورئانی دەخوێند گەیشتە ئەو ئایەتەی کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿...فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ...﴾ [النساء: ٣]

واتە: ((دەسا ئەو ژنانە مارە بکەن پێتان دەشێن، دوان دوان، سیان سیان، چوار چوار، واتە: هەریەکێکتان دەتوانن هەتا چوار ژن مارە بکەن، بەمەرجی عەدالەت و توانایی ژیاندنیان)).
ئافرەتەکە دەنگی خۆی نزم کردەوە و پیاوەکەش پێکەنی و وتی:
- ((تۆ بۆمن دووەم و سێیەم وچوارەمیشی)).

## • بۆچی ئافرەتی موسڵمان نادرێت بە نەسرانیەکان؟

نەسرانیەک لە شێخ ئەحمەد دیدات دەپرسێ:
- بۆچی شەریعەتەکەی ئێوە ڕێگە دەدات کە ئێوە لەگەڵ کچەکانی ئێمە هاوسەرگیری بکەن، بەڵام ڕێگەنادات ئێمە لە کچەکانی ئێوە بخوازین؟
شێخ دیداتیش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت:
- ئێمە باوەڕمان بە پێغەمبەرەکەتان هێناوە بۆیە کچەکانتان بۆمان حەڵاڵ کراوە، بەڵام ئێوە پێغەمبەرەکەی ئێمەتان بەدرۆ داناوە بۆیەش کچەکانمان لەسەرتان حەڕام کراوە!

## • بۆ تۆڵە ناستێنی؟

لە دانایەکیان پرسی:
- بۆچی تۆڵە لەو کەسە ناستێنی کە ئازار و ئەزیەتت پێدەگەیەنێت؟
- وتی: دەتانەوێ گاز لەو سەگە بگرم کە گازی لێگرتووم؟!

### • خۆشەویستی بەقەرز نابێ!!

ڕۆژێکیان هارونە ڕەشید لە بالول دەپرسێ:
- کێت لە هەموو کەس زیاتر خۆشدەوێ؟
- بالولیش دەڵێ: ئەو کەسەی سکم تێر بکات.
- هارون: ئەگەر من سکت تێربکەم منت خۆشدەوێ؟؟
- بالول: خۆشەویستی بەقەرز نابێت.

### • سەرۆک کۆماری عێراق و وەزیرێکی بەڕازیلی

دەڵێن جارێکیان وەزیرێکی بەڕازیلی دێتە سەردانی سەرۆک کۆماری عێراق (جەلال تاڵەبانی) کە ئەو کاتە لە هەرێمی کوردستان بوو، کاتێک دەگاتە کوردستان وەزیرەکە بە مام جەلال دەڵێت:
- ئەوە یەکەم جارە بزانم شوێنێک هەیە بەناوی هەرێمی کوردستان!!
مام جەلالیش هەر زوو وتبووی:
- ئێمەش هەر بە ڕۆناڵدۆ زانیومانە کە بەڕازیل وڵاتە، ئەگەرنا لای ئێمە هەر سەیارەیە!!

### • زەمانی قسەی بێ کردارە

شاعیرێک بە شیعرێکی جوان و بەهێز مەدحی پاشایەک دەکات، لەبەرامبەردا پاشا فەرمان بە خەزنەدارەکەی دەکات و دەڵێت:
- سەد سکەی ئاڵتونی پێبدە، بەڵام هەر ئەوسا بە ئاماژەیەک بە خەزنەدار دەڵێ سکەکانی پێمەدە!

شاعیرەکە بە سەرسوڕمانەوە وتی:
- ئەوە واتای چییە؟؟ لەلایەک فەرمان دەکەیت کە سکەی ئاڵتونیم پێبدەن و دواتریش هەر خۆت فەرمان دەکەیت کە پێم نەدەن!!
پاشا بە شاعیرەکەی وت:
- تۆ بە وشەکانی شیعرەکەت منت دڵخۆش کرد، منیش تەنها بەو قسە دڵی تۆم خۆشکردەوە!

## • ڕێزمان هەیە بۆی

پیاوێک چوو بۆ لای پزیشک و پێ وت:
- دکتۆر گیان ڕیشم سپی ئەبێ چیتان هەبێ بۆی؟
- دکتۆر: ڕێزمان هەیە بۆی!

## • خوێنەرەکان دزنین!

کتێب فرۆشێک هیچ شەوێک پەرتووکەکانی نەدەبردنەوە دوکانەکەی، ئەو کارەشی بووبووە جێی سەرنجی زۆرێک لە خەڵکی!
ڕۆژێکیان لێیان پرسی:
- ئەوە بۆ ئەو کتێبانە نابەیتە نێو دوکانەکەتەوە، ناترسی لێت بدزن؟
ئەویش وتی:
- نەخێر هەرگیز لەوە ناترسم، چونکە ئەوانەی کتێب دەخوێننەوە دزنین و دزەکانیش خوێنەر نین!!

## • بەرزتر ڕوانین

مامۆستایەک بە قوتابیەکانی دەڵێت:

- بابەتێک بنوسن وای دابنێن کە ئێستا ئێوە بەڕێوبەری کۆمپانیایەکی گەورەن!!

قوتابیەکان هەمویان کاغەزیان دەرهێناو دەستیان کرد بە نوسین...

تەنها قوتابیەک نەبێ!

مامۆستاکە لێی پرسی:

- ئەوە تۆ بۆ هیچ نانوسی؟

قوتابیەکە وتی:

- ئاخر مامۆستا گیان چاوەڕێی سکرتێرەکەم دەکەم کاغەزێکم بۆ بێنێ!

## • پیرە پیاوێکی بەوەفا

پیرە پیاوێک بەیانی زوو لەماڵەکەی هاتە دەرەوە، بەپێ دەڕۆیشت، دەیویست لەیەکێک لە شەقامەکان بپەڕێتەوە، بەڵام لەناکاو ئۆتۆمبێلێک لێیدا، پیاوەکە کەوتە سەر زەوی و خەڵکی لەدەوری کۆبونەوە و بردیان بۆ نەخۆشخانە.

پاش تیمارکردنی برینەکانی، پەرستارەکان پێیان وت:

- دەبێت ئامادەبیت بۆ گرتنی وێنەی تیشکی ئێسکەکانت.

پیاوەکە خەیاڵی ڕۆیشت وپاشان هەستاو بەشەلەشەل بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت و لەوکاتەدا وتی:

- بەڵام من پەلەمە، بۆیە پێویست بە تیشک ناکات!

پەرستارەکان هەوڵیاندا ڕازی بکەن، بەڵام سەرکەوتوو نەبون، لێیان پرسی:

- بەو نەخۆشی و برینانەتەوە بۆ کوێ دەچی؟ بۆچی پەلە دەکەی؟

پیرەمێردەکە وتی:

- ژنەکەم لەخانەی بەساڵاچوانەو، منیش هەموو بەیانیەک زوو دەچم و نانی بەیانی لەگەڵ دەخۆم، بۆیە نامەوێ درەنگ بکەوم!

یەکێک لە پەرستارەکان وتی:

- تۆ نیگەران مەبە، ئێمە هەواڵی دەدەینێ کە ئەمڕۆ درەنگتر دەگەیتە لای.

- پیرەمێردەکە وتی: بەداخەوە! ئەو نەخۆشە و دووچاری لەبیرچوونەوە و بێ زیهنی بووە و ئاگاداری هیچ نیە، ئەو تەنانەت منیش ناناسێت!

پەرستارەکە: چیی واتا تۆ ناناسێت؟ ئەی کەواتە بۆچی هەموو بەیانیەک دەچی نانی پێدەدەی کە ناتناسێت و نازانی تۆی کێی؟

پیرەمێردەکە بەدەنگێکی کزو غەمگینەوە وەڵامێکی جوانی پەرستارەکەیدایەوە وتی:

ڕاستە ئەو من ناناسێت و نازانێت من کێم، بەڵام خۆ من دەزانم ئەو کێ یە!!

- **هیچ کات درۆ نەکەی تەنانەت ئەگەر بۆ پەروەردەکردنی منداڵ، یان بۆ گاڵتەش بێ!**

منداڵێک لە باوکی پرسی :

- بابەگیان، بۆ چی تاڵە مووی سپی لە سەرت هەیە؟
- باوکی وتی: هەر جاری منداڵ هەڵەیەک بکات و باوکی لێی تووڕە بێت، ئەوا تاڵی مووی سپی لە سەری دەردەکەوێت!
- منداڵەکە وتی: ئێستا زانیم بۆ چی باپیرەم سەری هەموو سپی بووە!

## • دڵ شکان

گەنجێک لە پیاوێکی خاوەن ئەزموون دەپرسێت:
- ئایا ئەگەر دڵێک شکا دەتوانێ جارێکی تر مەیلی بەلای عیشقدا بچێت و خۆشەویستی بکاتەوە؟
- پیاوەکە: بێگومان بەڵێ.
- کوڕەکە: ئایا تۆ هەرگیز لە پەرداغی شکاودا ئاوت خواردۆتەوە؟
- پیاوەکە: ئەی تۆچی، لەبەر ئەوەی پەرداخەکە شکاوە تەرکی ئاو خواردنەوەت کردووە؟

## • علمی غەیب

ئەستێرەناسێک دەچێتە لای پیاوێک و پێی دەڵێ:
- ئەگەر دوو جونەیەم پێبدەی ئەوا ئەوشتانەی کە لە داهاتوودا لە ژیانی تۆدا ڕوودەدەن هەموویانت پێ دەڵێم!
- پیاوەکە: ئەگەر هەر بەڕاستی تۆ زانستی غەیب و پەنهانیت بزانیبا ئەوا دەتزانی کە من تەنها یەک جونەیەی لە گیرفانم دایە!
کابرای علم زان بێ دەنگ بوو و پیاوەکەی جێهێشت!!

• بۆچی وەکو جاران نی لەگەڵم؟

دوای هاوسەرگیریان ژنەکە پرسیاری لە پیاوەکەی کرد و وتی:

- باشە تۆ بۆچی خیلافی ئەو پەیمانانە دەکەیت کە سەردەمی دەستگیرانداری بەڵێنت پێدابووم؟

پیاوەکە: ئایا تۆ هەرگیز ماسی گرت بینیوە کە دوای گرتنی ماسیەکە هیچ خواردنێک بدات بە ماسیەکە؟

## شێخ شەعراوی و توندڕەوێک

جارێکیان شێخ شەعراوی لەگەڵ گەنجێکی توندڕەو دەکەوێتە گفتوگۆوە، شێخ شەعراوی لە توندڕەوەکە دەپرسێت:

- ئایا خۆ تەقاندنەوە لە مەلیهایەک، لە وڵاتێکی ئیسلامی بە جائیز دەزانی و کوشتنی کەسەکانی ناوی بە حەڵاڵ دەزانی؟

- گەنجەکە: گومانم لەوەدانیە، بەڵێ.

- شێخ شەعراوی: دوای ئەوە کوژراوەکان بۆ کوێ دەچن؟

- توندڕەوەکە: بۆ دۆزەخ.

- شێخ شەعراوی: هەموو هەوڵی شەیتان بۆ چییە؟

- توندڕەوەکە: هەموو هەوڵێکی ئەو بۆ ئەوەیە خەڵکی لە دینداری وەربگێڕێت و بەرەو دۆزەخیان ببات.

- شێخ شەعراوی: کەواتە ئەو بیرکردنەوەی تۆ کارئاسانی بۆ شەیتان دەکات، تۆ دەتەوێ خەڵک بکوژی و دواتریش وەک خۆت

دەڵێی دەچنە دۆزەخ، شەیتانیش هەمان ئەو شتەی دەوێ کە تۆ دەتەوێ.

((ئەمە لە کاتێکدایە کە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بۆ مردنی جولەکەیەک گریاوە، لێیان پرسیووە: هۆکاری گریانت چییە ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، فەرمووی: نەفسێکم لە دەست چوو نەمتوانی بەرەو بەهەشت ڕێنمونی بکەم)).

- **گفتوگۆیەک لە نێوان زانست و سەروەت وشەڕەف**

ڕۆژێکیان زانست و سەروەت و شەڕەف کۆبوونەوە، ئەم گفتوگۆیە لەنێوانیاندا ڕوویدا:

- سەروەت وتی:

**جادووی من بەسەر خەڵکیەوە زۆر گەورەیە.**

**ڕەونەقی من گەورە و بچوک بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت.**

**بەمن قەیرانەکان کۆتاییان پێ دێت.**

**لە نەبوونی مندا کێشە و گرفتەکان ڕوودەدەن.**

- **زانستیش وتی:**

**من لەگەڵ عەقڵەکاندا هەڵسوکەوت دەکەم.**

**من بە دانایی و لۆژیک و یاسا دانراوەکان**

**کێشەکان چارەسەر دەکەم**

**نەوەک بە دینار و دیرهەم.**

**من لە بەرەبەرەکانێیەکی بەردەوام دام**

لە پێناو مرۆڤ لە دژی دوژمنەکانی مرۆڤایەتی،
نەزانی و هەژاری و نەخۆشی.
- شەرەفیش وتی:
بەڵام من نرخەکەم زۆر گرانە، نەدەکڕدرێت نە دەفرۆشرێت،
کەسێک سووربێت لەسەرم ئەوا شکۆداری دەکەم..
هەرکەسێکیش منی نەوێ، زەلیل و ڕیسوای دەکەم!
کاتێک هەر سێکیان ویستیان بڕۆن، وتیان: باشە چۆن یەکتر ببینینەوە؟
- سەروەت وتی:
براکانم ئەگەر ویستان من ببینن ئەوا لە کۆشکێکی گەورەدا بەدوای مندا بگەڕێن.
- زانست وتی:
ئەگەر منیشتان ویست، ئەوا لە کۆڕی زانایان و زانکۆکاندا من دەدۆزنەوە.
شەرەف بێ دەنگ بوو...
بەڵام دوو هاوڕێکەی پرسیاریان لێکرد: بۆ قسە ناکەیت؟
ئینجا ئەویش هاتە قسە و وتی:
- من کە ڕۆیشتم هەرگیز ناگەڕێمەوە!

## • سەعیدی نورسی و بێ باوەڕێک

- بێ باوەڕ: ئێوە دەڵێن خودا لە یەک کاتدا هەموو کەسێک دەبینێت، باشە پێم نالێی خودا چۆن دەتوانێ لەیەک کاتدا گوێبیستی سەد مرۆڤ بێت؟

- سەعیدی نورسی: باشە بە لای ئێمەوە خودا گەورەترە یان خۆر؟

- بێ باوەڕ: بێگومان خۆر.

- سەعیدی نورسی: ئەگەر سەد کەسمان هەبێت، لەبەرەبەیان خۆر بێتە دەر لەسەر هەر سەد کەسەکە دەدات؟

- بێ باوەڕ: بە دڵنیاییەوە بەڵێ.

- باشە خۆرێک کە یەکێک لە دروستکراوەکان بتوانێ ئەو کارە بکات، چۆن دروستکەری خۆر ناتوانێ ئەو کارە بکات؟

بێ باوەڕەکە نوقەی لێبڕا و هیچی تری نەوت.

ئینجا سەعیدی نورسی بەردەوامیدا بەقسەکانی و وتی:

بێ عەقڵی و گەمژەیی ئێوە لەوەدایە کە هێزی خودا بە هێزی بەندەکان بەراورد دەکەن، جا ئەگەر هێزی خودا هەروەک هێزی بەندەکان بێت چۆن ئەو خودایە شیاوی پەرستن دەبێت، ئاخر بۆیە دەپەرسترێ چونکە هێز و دەسەڵاتی ئەو لەبن نەهاتووە و بێ وێنەیە!

## • قاچی من یان ڕووخساری تۆ؟

لەیەکێک لە وڵاتە ئەوروپیەکان و یەکێک لە شوێنەکانی دەست شوتن، گەنجێکی موسڵمان خەریک بوو دەستنوێژی دەگرت، لەوکاتە گەنجێکی غەیرە مسڵمان دێت، کە لەو کاتەدا گەنجە موسڵمانەکە خەریکی قاچ شوتنیەتی و قاچەکانی خستۆتە سەر شوێنی شوتنەکە چونکە هیچ شوێنێکی تری لێنەبوو کە قاچەکانی لێبشوات.

گەنجە غەیرە موسڵمانەکە کە ئەمەی بینی بە گەنجە موسڵمانەکەی وت:

- تۆبۆچی ئەو قاچە پیسانەت دەخەیە سەر ئەو مەغسەلەیە، تۆنازانی ئێمە لێرە دەمووچاومان دەشۆین؟

گەنجە موسڵمانەکە زۆر بەهێمنی وەڵامی دایەوە وتی:

- تۆ ڕۆژی چەند جار دەموو چاوت دەشۆی؟

- غەیرە موسڵمانەکە: بەیانیان کە هەڵدەستم دەیشۆم و هەندێک جاریش ئەگەر گەرمام بێت یان کارێک بکەم جارێکی تر دەیشۆم..

- گەنجە موسڵمانەکە: دەسا بزانە بەڕێزم، ئێمە ڕۆژانە (٥) جار تەنها وەک واجب دەبێت دەم و چاو و دەست و قاچەکانمان بشۆین، جگە لە شوشتنەکانی تر...جا ئێستا تۆ پێم بڵێ قاچی من پاکترە یان ڕووخساری تۆ؟

قسەیەکی بۆ وتن نەمایەوە و ڕەنگی سورهەڵگەڕا و ئەوەی بۆشی هاتبوو لەبیری چوو و ڕۆیشت!

## • وەڵامی ژنێکی ژیر بۆ پیاوێکی گەمژە

پیاوێکی گەمژە دەیویست سوکایەتی بە ژنێک بکات، بە ژنەکەی وت:
- باشە ئێوە بۆچی لەسەر ئەو جوانیە و بەڵام لەسەر ئەو بێ عەقلیە دروستکراون؟؟
- ژنەکە: هۆی جوانیەکەمان ئەوەیە تا گەمژەکانی وەک تۆ هەمووشتێکمان لەپێناو بکەن و خۆشیان بوێین، بێ عەقڵیەکەشمان لەوەدایە کە کەسێکی وەک تۆمان خۆشبوێ!!

## • زانستی فەلسەفە

پیاوێکی بەتەمەن...کوڕەکەی لە یەکێک لە وڵاتە ئەوروپیەکان بڕونامەی دکتۆرا لە زانستی فەلسەفە بەدەست دهێنێت...
ڕۆژێکیان لە حەوشەیماڵەکەیان لەگەڵ باوکی لەسەر مێزی نان خواردن دانیشتبوون، باوکەکە لە کوڕەکەی دەپرسێ:
- کوڕەکەم دەپێم بڵێ تۆ بە دیاریکراوی لەسەر چ بابەتیک دکتۆرات بە دەست هێناوە؟؟ دکتۆراکەی تۆ واتا لەمەودوا چارەسەری نەخۆشیەکانی خەڵک دەکەیت؟؟
- کوڕەکە: نا باوکە، دکتۆراکەی من لە زانستی فەلسەفەیە.
- باوک: فەلسەفە واتای چییە کوڕم؟
- کوڕە ئێستا من تێتدەگەیەنم کە فەلسەفە واتای چی.
باوکە ئێستا من و تۆ لەسەر ئەم مێزی نان خواردنە قاپێک برنج و مریشکێکمان لەبەردەمدانیە؟

- باوک: با ڕاست دەکەی.
- کوڕەکە: باوکە ئێستا من دەتوانم بە زانستی فەلسەفە بۆت بسەلمێنم کە ئەوە دوو قاپ برنج و دوو مریشکن، نەوەک یەک قاپ برنج و یەک مریشک!
باوکەکە مریشکەکەی خستە سەر برنج و دواتریش وتی:
- تەواو کوڕم من باوەڕم کرد، ئەو دانە مریشک ئەو قاپە برنجە بۆ من ئەوەی تۆش زیادی دەکەیت بۆ خۆت! کوڕەکە شڵەژا و پەشیمان بوویەوە لەوەی کە باوکی وت.

## • گفتوگۆیەک لە نێوان حەق و ناحەقدا

ڕۆژێکیان حەق و ناحەق لە ڕێگادا بەیەک گەیشتن و ئەم گفتوگۆ کورتە لە نێوانیدا ڕوویدا:
- ناحەق: من سەرم لە تۆ بەرزترە.
- حەق: من قاچەکانم لە تۆ جێگیر و چەسپاوترن.
- ناحەق: من لە تۆ بەهێزترم.
- حەق: من لەتۆ زیاتر دەمێنمەوە.
- ناحەق: بەهێزەکان و خۆشگوزەرانەکان لەگەڵ منن.
- حەق بە ئایەتێک کۆتایی بە گفتوگۆکە هێنا و وتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا ۖ وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾ [الأنعام: ١٢٣] واتە: ((ئا بەو شێوەیە، لەناو **هەموو** شارو

شارۆچکەیەکدا گەورەترینی تاوانباریانمان باڵادەست کردوە تا پیلان و تەڵەکە بگێڕن تیایدا، (بێ ئەوەی بزانن) کە: هیچ فێڵ و تەڵەکەیەکیش ناکەن بەزیانی خۆیان تەواو نەبێت، لەکاتێکدا هەست بەوە ناکەن، پیلان دژی خۆیان دەگێڕن و بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە (بەلام) هەستی پێناکەن (چونکە غافڵ و بێ ئاگان کە بەرەو لێواری مەرگ هەنگاو هەڵدەگرن و لە سزای پەروەردگار دەرباز نابن)).

## • کەواتە بۆ غەمبار بین؟

پیاوێکی غەمبار پرسیاری لە دانایەک کرد، ئەی دانا، من هاتووم بۆ لات تاوەکو هۆکاری غەمباریم بزانم؟

- داناکە: من دوو پرسیارت لێدەکەم، وەڵامەکەیانم پێبدە.

- پیاوەکە: فەرموو بپرسە.

- داناکە: ئایا کاتێک هاتیە دونیا ئەو غەم و کێشانەت هەبوون؟

- پیاوەکە: بەدڵنیاییەوە نەخێر.

- داناکە: ئایا کاتێک ئەم دونیایە جێدههێڵیت غەمەکانت لەگەڵ خۆتدا دەبەیت؟

- پیاوەکە: بەدڵنیاییەوە نەخێر.

داناکە: شتێک کە لەگەڵت دانەبووبێت و، لەگەڵ خۆتدا نەیبەیت...کەواتە بۆچی کۆڵ دەدەیە بەر غەمەکانت، بۆیە لە دونیادا ئارامگربە، با دیدگات بۆ ئاسمان درێژتر بێت لە بینینت بۆ زەوی، تاوەکو چیت بوێ پێی بگەیت.

زەردەخەنە بکە و پێبکەنە...ڕزقەکەت دیاریکراوەو قەدەریشت یەکلایی کراوەتەوە، کارەکانی دونیاش شیاوی غەم خواردن نین، چونکە گشت کارێک بەدەستی زاتی هەمیشە زیندوو و بە ئاگایە کە ئەویش (الله)یە.

یەکێک لە داناکان دەڵێت: باوەڕدار لەنێوان دووشتدا دەژیت: یەکێکیان ئاسان و ئەوەی تریان قورس، هەردووکیشیان نیعمەتن، ئەگەر باش لێیان وردبیەوە.

لە ئاسانیدا شوکرانە هەیە، ﴿...وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ [آل عمران: ١٤٤] واتە: ((دڵنیاشبن کەخوا پاداشتی شوکرانە بژێران ئەداتەوەو سەریان دەخات)).

لە قورسیشدا، ئارامگرتن هەیە، ﴿...إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ [الزمر: ١٠] واتە: ((بەڕاستی تەنها خۆگران پاداشتیان بێ سنوور و بێ ئەندازەیە)).

### • وەڵامە جێگیرەکان

لە دانایەکیان پرسی: کێ بەهێزە لە خەڵکیدا؟ وتی: ئەو کەسەیە کە دەتوانێت توڕەیی خۆی بشارێتەوە و دایبمرکێنێتەوە.

پێی وترا: ئەی کێ لاوازە؟ وتی: ئەو کەسەی بەدەنگ و وتەکانی خۆی سەرسامە.

وترا: کێ زۆر زانایە؟ وتی: ئەو کەسەی کە دوو کەس لەسەری ڕا جیاوازن.

وترا: کێ سادە و ساکارە؟ وتی: ئەو کەسەی کە دووکەس لەسەری هاوڕابن.
وترا: کێ عاقل و هۆشمەندە؟ وتی: ئەو کەسەی مل دادەنوێنێ بۆ گەردەلوولەکان.
وترا: کێ شێتە؟ وتی: ئەوەی بانگەشەی عاقلی دەکات.
وترا: کێ بێ زانست و عیلمە؟ وتی: ئەو کەسەی کە خۆی پێ زاناترین کەسە.
وترا: کێ زۆر بلێیە؟ وتی: ئەو کەسەی کە بەبێ واتا قسە دەکات.
وترا: کێ زمان پاراوە؟ وتی: ئەو کەسەی کە کورتبڕە لە قسەکردندا.
وترا: ئەی کێ زانایە؟ وتی: ئەو کەسەی کە مەعریفەی لایە.
وترا: کێ نووسەرە؟ وتی: ئەو کەسەی کە بە هەستەوە بۆ دەروونی دەنووسێت.
وترا: کێ ڕاستگۆیە؟ وتی: ئەو کەسەی کە سەرەتا لەگەڵ خۆیدا ڕاست بێژە.
وترا: ئەی کێ درۆزنە؟ وتی: ئەو کەسەی کە شەیتانە.
وترا: کێ عەیبدار و خاوەن کەم وکورتیە؟ وتی: مرۆڤ.
بە داناکە وترا، ئەی کێ کامل و تەواوە؟ وتی: تەنها خودای گەورە .

- **ئاگاداری تەلەفیزیۆن بن!**

باوکێک بە منداڵەکەی وت :
- ئا ڕۆڵە کۆنترۆڵی تەلەفیزیۆنەکەم بۆ بێنە تا کەناڵەکە بگۆڕم.

کوڕەکە کۆنترۆڵەکەی بۆ باوکی هێنا و بە باوکی وت:
باوکە گیان ئاگاداربە ئەو کەناڵەی کە تۆ دەیخەیتە سەرتەلەفیزیۆنەکە نەتگۆڕی!

- **هەموو دروست کراوێک لە چاو درووستکەرەکەی هەر وایە**

پرسیاریان لە (ئەدیسۆن) کردو وتیان :
- تۆ باوەڕت بە بوونی خوا هەیە؟

لە وەڵام دا وتی :
- بێگومان بڕوام بە بوونی خوا هەیە.
- وتیان : ئەی بۆچی نایبینی؟
- وتی: من کارەبام دروست کردووە زۆر بە باشی ئەو دەناسم، بەڵام ئایا کارەبا من دەناسێت و هەست بە من دەکات؟
- وتیان : نا!

وتی : هەموو دروست کراوێک لە چاو درووستکەرەکەی هەر وایە.

- **وەڵامی ئافرەتێکی حەکیم**

سەبارەت بە چەند ژنی پرسیار لەئافرەتێکی حەکیم کرا لەوەڵامدا وتی:

- چەند ژنی (بە دەستەواژە هەڵەکەی "فرەژنی"): بەڕۆژی ڕوناک، لە ژێر چاودێری خوداو بەپێی شەریعەتی خودا، زۆرباشترە لەفرەدۆستی لەتاریکای شەو، بەچاودێری شەیتان و دوور لەشەرعی خودا!

## • خومرەی خراپ هەویری خراپی لێ دروست دەبێ!

ژنێک منداڵەکەی بردە لای پزیشکێکی دەروونی و پێی وت:

- دکتۆرگیان منداڵەکەم هەرچەندە تەمەنی بچووکە، بەڵام بەردەوام درۆ دەکات.

لەوکاتەدا زەنگی مۆبایلی دایکەکە لێیدا، وەڵامی دایەوەو وتی:

- ببورە لەبازاڕم !

پزیشکەکە پێی وت: خومرەی خراپ هەویری خراپی لێ دروست دەبێ!

## • وەڵامی دانایەک

کابرایەک چوە لای دانایەک وپێی وت:

- فلانە کەس قسەی پێ دەوتیت !

ئەویش پێی وت:

ئەو تیرێکی بۆ هاویشتم و نەیپێکام.

تۆ بۆ هەڵیدەگریتەوە و ئەیکەیت بەدڵما؟!

## • گفتو گۆی نێوان کچ و کوڕێک

کچێک بە ڕێگادا دەڕۆیشت...جلێکی ڕووتی پۆشیبوو، کوڕێکیش لەبەرامبەریەوە دەهات و بەمەبەست توانجێکی لێدا، دواتریش ئەم گفتوگۆیە لە نێوانیاندا ڕوویدا:

کچ: من ئازادم چ جلێک له بەر دەکەم و بۆت نیه شێوازی جل و بەرگ بۆ من دیاری بکەیت.

کوڕ: منیش ئازادم له هەرچیەک دەیڵێم.

کچ: ئەبێ یاسایەک دابنرێ که توانج دان له کچان سزای له سەر بێ

.

کوڕ: ئەبێ یاسایەکیش دابنرێ که خۆ ڕووت کردنەوەی کچان سزای له سەر بێ.

کچ: ئەگەر دەتەوێ من نەبینی ئەتوانی چاوەکانت داخەی.

کوڕ: ئەگەر دەتەوێ گوێت لێم نەبێت ئەتوانی گوێیەکانت دابخەی.

کچ: بەڵام تۆ به قسەکانت ئازارم دەدەی .

کوڕ: تۆش به شێوازی جل و بەرگەکەت ئازارم دەدەی.

کچ: بەڵام خوای گەورە فرمانی پێ کردووی که چاوەکانت بپارێزی.

کوڕ: خوای گەورەش فرمانی به تۆ کردووە که لەشت بپارێزی.

- **بـــەڵام هەندێ شتـم لەدەس داوە!**

لەخودا ناسێکیان پرسی:

– لەو هەموو نزاکردن و پاڕانەوانەت له خودا هیچت بەدەست هێناوە؟

وەڵامی دانەوە و وتی:

– نەخێر!

بەڵام هەندێ شتم لەدەست داوە!

وەک:
توڕەیی، نیگەرانی، دڵە ڕاوکێ، خەمۆکی، هەستی نامۆبوون و ترس لەمردن.. نابێت هەمیشە تێبکۆشین بۆئەوەی کۆمەڵە شتێک بەدەست بهێنین، هەندێک جار بە لەدەستدان ئاسودەتر دەبین!!

## • حاڵی کتێب فرۆشێک

لە کتێب فرۆشێکیان پرسی:

- ڕزق و ڕۆزیت و بازاڕت چۆنە؟

- وتی: زۆر خراپە.

- وتیان: بۆچی ؟

- وتی: پارەدارەکان خوێندەواریان نییە گەر هەشیان بێ ناخوێننەوە، خوێندەوارەکانیش پارەیان نییە!!

## بۆچی بەردەوام بۆ خەمێک دەگریەین؟

جارێکیان چارلی چاپلن نوکتەیەکی زۆر خۆشی بۆ جەماوەرەکەی خۆی گێڕایەوە.. هەمویان لە قاقای پێکەنینیاندا... زۆر پێی پێکەنین.
پاش ئەوە دوبارە هەمان نوکتەی گێڕایەوە، خەڵکەکە کەمترپێکەنین!
پاشان نوکتەکەی سێ بارە کردەوە، ئەمجارە کەس پێنەکەنی!
دوای ئەوە ڕووی کردە جەماوەر و وتی:
"کاتێک ئێمە ناتوانین دوبارە و دوبارە بە هەمان نوکتە پێبکەنین.
ئەی باشە بۆچی دوبارە و دوبارە بۆ هەمان خەم دەگریەین و خەمبار دەبین؟!

- لوتکەی سەرسامبون!

بە گاڵتەوە لە دانایەکیان پرسی:

- مرۆڤ چ کاتێک دەگاتە لوتکەی سەرسامبوون؟

ئەویش هەر بە گاڵتە وەڵامی دانەوە و وتی:

- بچیتە ماڵێکەوە و بت بەن بۆ ژوورێکی بازنەیی و پێت بڵێن لە سووچەکە دابنیشە!!

- وتیان: ئەی لوتکەی ژیری لە چی دایە؟

- وتی: بتوانی سووچی ژوورەکە بدۆزیەوە!

دواتر لەسەر گاڵتەکەیان بەردەوام دەبن و دەڵێن:

- باشە ئەی لوتکەی ئەدەب و ڕەشت لە چی دایە؟

- وتی: بەر لەوەی دەرگای سەلاجە بکەیتەوە لە دەرگا بدەیت!

- وتیان: ئەی لوتکەی بێ عەقلی لە چی دایە؟

- وتی: دوای سێ جار لە دەرگادانی سەلاجەکە دەرگاکە بە ئێوە بکەنەوە!!

چیتریان نەووت و ڕۆیشتن...

- ئاگاداربە نەخلیسکێی!

ڕۆژێکیان پێشەوا حەنیفە (الإمام أبو حنيفه النعمان) بەلای منداڵێکدا تێپەڕ دەبێت، دەبینێ منداڵەکە یاری بەقوڕ دەکات، ئەویش لەپەرۆشی بۆی بە منداڵەکە دەڵێت:

- ڕۆڵە ئاگاداربە لەسەر قوڕەکە هەڵنەخلیسکێی!

منداڵەکەش ئاورێکی لێدایەوە و بینی کە پێشەوا حەنیفەیە و وتی:
- پێشەوا تۆ ئاگاداری خۆتبە هەڵنەخلیسکێی، چونکە ئەگەر تۆ هەڵبخلیسکێی و بکەوی، ئومەتێک هەڵدەخلیسکێ و دەکەوێ، بەڵام کەوتنی من تەنها زیان بەخۆم دەگەیەنێ!!

## • وەڵامێکی جوانی دکتۆر زاکیر نایک

لە کۆڕێکدا کەسێک دوو پرسیاری لە دکتۆر زاکیر کرد:
- پرسیاری یەکەم: بۆچی خودا خۆی نەهاتە سەر زەوی؟
- پرسیاری دووەم: بۆچی خودا پێغەمبەرێکی تر نانێرێ، چونکە پێم وایە کە جیهانی ئەمڕۆ پێویستی بە پێغەمبەرێکی ترە دوای محمد؟
دکتۆر زاکیر لە وەڵامدا وتی:
- من وەڵامی پرسیارەکانت بە کۆمپانیەکی تایبەت بە ئۆتۆمبێل دەدەمەوە!
١- ئایا کە تۆ ئۆتۆمبێلت کڕی، خاوەنی کۆمپانیا لەگەڵت هاتە دەرەوە تاوەکو چۆنیەتی کارکردنی ئۆتۆمبێلەکەت پێبڵێ؟
- کابرا: نەخێر، بەڵکو لە ڕێی کەتەلۆک و ڕێنمایی و بریکارەکانەوە ئەو شتانەیان پێوتم.
- دکتۆر: خودای گەورەش لە ڕێگەی پێغەمبەرەکانەوە هەمووشتێکی بە ئێمە گەیاندووە!!!

٢- ئایا ئەو کۆمپانیایەی کە ئۆتۆمبێلێک دروست بکات، واتە هەموو تایبەتمەندی و مواسەفاتێکی هەبێت و هیچ کەم و کوڕیەکی نەبێت...ئایا ئۆتۆمبێلی ترت پێویستە؟ بێگومان نەخێر.
جا کەوایە دوای محمد (ﷺ) جیهان پێویستی بە پێغەمبەرێکی تر نیە.

## • ئەگەر بڵێم نەخێر ڕاست دەکەم!

لە درۆزنێکیان پرسی:
- ئایا ڕۆژێک لە ڕۆژان قسەی ڕاستت کردووە؟
- وتی: ئەگەر بڵێم نەخێر.
ئەوا ڕاست دەکەم.

## • وەڵامی عارفێکی خواناس

دەگێڕنەوە کە لە کۆندا عارفێکی خواناس و دیاری ناوچەکە دەچێتە نانەواخانەیەک و داوای نانێک لە خاوەنی نانەواخانەکە دەکات.
بەڵام چونکە ئەو دونیا نەویست بوو، جلێکی هەژارانەی لەبەربوو، خاوەن نانەواخانەکە نانەکەی پێنەدا و دەری کرد...
عارفەکە دەڕوات...
لەو کاتە کە پیاوێکی تریش هەر لە نانەواخانەکە وەستابوو بە خاوەنی نانەواخانەکەی وت:
- بۆچی نانێکت بەو پیاوە نەدا؟ ئایا نەتناسی؟
- وتی نەخێر نەمناسی.

- کابرا: ئەوە فڵانە زانای خواناس بوو!

کاتێ ئەمەی وت خاوەنی نانەواخانەکە شڵەژا و وتی:

- ئەوە بەڕاستتە؟! من زۆر سەرسامی ئەو پیاوەم و خۆم بە خزمەتکاری ئەو دەزانم، ئەوم زۆر خۆشدەوێ...بەخێرایی بەدوای عارفەکە دەکەوێت تا دەی دۆزێتەوە و پێی دەڵێ:

- بمبورە، بەخوا نەمناسیتەوە، دەنا چۆن نانت پێنادەم، من بەنیازم ببم بە قوتابی تۆ، ئایا قبوڵم دەکەیت؟

- عارفەکە ڕازی نەبوو...

خاوەنی ناواخانەکە زانی هەڵەیەکی کردووە و دڵی عارفەکەی شکاندووە، ویستی دڵی چاک بکاتەوە، هەر بۆیە وتی:

- ئەگەر تۆ لێم ڕازی بی و بە قوتابی خۆت قبوڵم بکەیت، ئەوا من ئەمشەو تەواوی خەڵکی لادێکە دەعوەت دەکەم، پیاوە عارفەکەش بەم دەستپێشخەرییەی ڕازی بوو...

ئێوارە کە هەموان نانیان خوارد.

خاوەنی نانەواخانەکە وتی:

مامۆستا پرسیارێک:

- مامۆستا فەرموو...

- خاوەن نانەواخانەکە: ئایا دۆزەخ واتای چییە؟

- پیاوە عارف و خواناسەکە: دۆزەخ واتا ئەوەی کەتۆ لەبەر خاتری خودا یەک نانت بە بەندەیەکی خودا نەبەخشی، کەچی بۆ ڕازی کردنی دڵی بەندەیەکی خودا نانی یەک لادێت دابین کرد!

کابرا خەجاڵەت بوو و زانی ئەوەی کردوویەتی لە پێناو خودا نەبووە!

**• لە نێوان مامۆستا و قوتابیەک**

لە کۆندا لە یەکێک لە شارەکاندا مامۆستایەکی زۆر لێهاتوو و بلیمەت هەبوو، لە تەواوی شارو و شارۆچکە و لادێکانی دەوروبەرەیەوە خەڵکی دەهاتنە لای بۆ فێربوونی زانست و زانیاری، لە نێویشیاندا گەنجێکی یۆنانی هەبوو، کە (تیسیاس)یان پێ دەوت، ئەو گەنجە زیاتر لە هەموو گەنجانی تر ئارەزووی زانست و زانیاری دەکرد...کاتێک ماوەیەکی زۆر تێپەڕی و زانستێکی باش فێربوو، ویستی گفتوگۆ و مشتومڕێکی لەگەڵ مامۆستاکەیدا بکات، بە مامۆستاکەی خۆی وت:

- پێناسەی وتار چییە؟

مامۆستاش بە دوو وشە وەڵامی دایەوە و وتی:

- ئیقناع پێکردن و سودگەیاندنە.

گەنجەکە: کەواتە من مشتومڕ و گفتوگۆیەکت لەگەڵدا دەکەم سەبارەت بە کرێی وانە وتنەوەکانت بە من، ئەگەر هاتوو من تۆم ئیقناع کرد بەوەی کە کرێیەکەت پێنەدەم ئەوا هیچ لە حەقەکەت پێنادەم، ئەگەر نەشمتوانی ئیقناعت بکەم، ئەوا هەر هیچت پێنادەم؛ چونکە دیارە تۆ باش زانستەکەت فێری من نەکردووە!

مامۆستاکەش وتی: کەواتە منیش گفتوگۆیەکت لەگەڵدا دەکەم، ئەگەر هاتوو تۆم ئیقناع کرد ئەوا دەبێ تەواوی حەقەکەم پێبدەی، بەڵام

ئەگەر تۆم پێ ئیقناع نەکرا، ئەوا هەر دەبێ حەقەکەم پێ بدەی، چونکە ئەوە دەیسەلمێنێ کە تۆ زۆر باش زانستی ئیقناع کردن فێربووی، بەشێوەیەک کە دەتوانی بەسەر مامۆستاکەشدا سەرکەوی!! گەنجە هیچی بۆ نەمایەوە و وتی: فەرموو ئەوە حەقەکەت.

## • وەلید و پادشای ڕۆم

لەیەکێک لە جەنگەکاندا دوای سەرکەوتن وەلید یەکێک لە کەنیسەکان وێران دەکات و تێکی دەدات، پادشای ڕۆمیش لە نامەیەکدا بۆ وەلید دەنووسێ:

- تۆ کەنیسەیەکت تێکدا کە پێشتر باوکت بینیبووی و دەسەلاتیشی هەبوو تێکی بدات بەلام وازی لێهێنا و وێرانی نەکرد، جا ئەگەر تۆ خۆت بە ڕاست بزانی ئەوا دیارە باوکت هەلەی هەکردووە، ئەگەر تۆش هەلەبی بیانووت چییە؟

- وەلیدیش وەلامی نامەکەی پادشای ڕوومی دایەوە و تەنها ئەو دوو ئایەتەی بۆ نووسی بوو کە خودای گەورە دەفەرمووێت:- ﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ... ﴾ [الأنبياء: ٧٨ - ٧٩] واتە: ((باسی داوود و سولەیمان بکە کاتێ بڕیاریان دەرکرد دەربارەی ئەو کشتوکالەی کە بەشەو ئاژەڵی کەسانێک تێیدا

لەوەڕابوون (زیانیان لێ دابوو) وە ئێمە بۆ دادوەری بڕیارەکەیان ئامادە(ئاگادار) بووین.
ئەوسا ئێمە ئەوە (دادوەری چاکتر) مان فێری سولەیمان کرد(سولەیمان وتی: ئاژەڵە زیان خۆرەکە بدرێتە دەست خاوەن کشتوکاڵەکە کەڵک لە شیرو بەرهەمیان وەربگرێ وە کشتوکاڵەکەش بدرێتە دەست خاوەن ئاژەڵەکە بەروبوومەکەی بخۆن و خزمەتی بکەن تا وەک پێش زیان لێکەوتنەکەی لێ دێتەوە لەو کاتەدا ئاژەڵەکە بگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی و کشتوکاڵەکەش بۆ خاوەنەکەی) وە بەر هەر یەک لەو دووانە (داوود و سولەیمان) پێغەمبەرێتی (دادوەری) و زانستمان پێدان وە ڕاممان هێنا لەگەڵ داوودا چیاکان و باڵندەکە تەسبیحاتی خوایان دەکرد وە هەر ئێمە ئەوەمان کرد بۆ داوود)).

- **گفتوگۆیەکی کورت لە نێوان پێشەوا عەلی و کەسێکی تر**

پیاوێک بە پێشەوا عەلی (خودا لێی ڕازی بێت) وت:
- بۆچی تۆ هەر بە سواری ئەو هێسترە دەچی بۆ جەنگ؟ (دیاربوو پێی خۆشبوو کە پێشەوا عەلی ئەسپێکی باشی پێ بێت، چونکە بڕوای ئەو ئەسپ زیاتر لە شکۆی ئەو دەهات).
پێشەواش بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوە و وتی:
- ئەی پیاو، خۆ من لە کەسێک ڕاناکەم کە بەدوام کەوتبێ، هەروەها بەدوای کەسێکی هەڵاتووش ناکەوم، جا کەوایە ئەم هێسترە بەسە بۆم!

• چەند وەڵامێکی جوانی کوڕی ئەبو دوئاد بۆ ئەبو عەینا

ڕۆژێکیان ئەبو عەینای هاشمی لای کوڕی ئەبو دوئاد سکاڵای حاڵی خۆی دەکرد و دەی وت:

- ئەی کوڕی ئەبو دوئاد کۆمەڵە کەسانێک بەسەرمدا زاڵ بوون.

- کوڕی ئەبو دوئاد: زاڵبوونی ئەوان بەسەرتدا زیانت پێناگەیەنێ، چونکە ﴿ ...يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ... ﴾ .

دواتر ئەبو عەینا وتی:

- بەڵام ئەوان کۆمەڵەیەکی زۆرن و منیش تەنهام!!

- کوڕی ئەبو دوئاد وتی: ﴿ ...كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ .

- ئەمجارە ئەبو عەینا وتی:

- من زۆر لە مەکر و فڕ و فێڵیان دەترسم!!

- کوڕی ئەبو دوئاد وتی: ﴿ ...وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ... ﴾

بەو وەڵامانە ئەبو عەینا دڵی خۆشبوو و ترس و بیمی لە دڵدا نەما...

• دەشتەکیەک و سواڵکەرێک

ڕۆژێک سواڵکەرێک دەچێتە بەر دەرگای ماڵی دەشتەکیەک و دەڵێ:

- لە ڕێی خودا شتێکم پێبدەن!!

- دەشتەکیەکەش دەڵێ: شتێکی وام نیە کە لە خۆم زیاد بێ، ئەوەی هەمە خۆم پێویستیم پێیەتی و ناتوانم پێت بدەم...

- سواڵکەر: کوان ئەوانەی ﴿...وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ...﴾.

دەشتەکیەکەش وەڵامی دایەوە و وتی:

- لەگەڵ ئەوانە ڕۆیشتن کە ﴿...لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا...﴾.

## • وەڵامێکی بەهێزی یەحیای کوڕی ئەکسەم، بۆ سفیانی کوڕی عویینە

ڕۆژێکیان لەمەجلیسێکدا سوفیان دەست دەکات بە گریان، یەحیاش لێی دەپرسێت:

- ئەوە چیتە سوفیان بۆچی دەگریەی؟

- سوفیان وتی:

- بۆ ئەوە دەگریەم کە پێشتر لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دادەنیشتم، ئێستاش وا دەبینی لەگەڵ کێ دانیشتووم، جا چۆن نەگریەم!

یەحیاش وەڵامی دایەوە و وتی:

- کەواتە موسیبەتی هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) زۆر لە هی تۆ گەورەتر بووە، چونکە ئەوان پێشتر لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) دادەنیشتن، دواتریش لە کن تۆ!!

سوفیان قسەیەکی بۆ وتن نەمایەوە و وپەشیمان بوویەوە لەوەی کە وتی.

## • گرنگ ئەوەیە ڕاست و حەق بێت

بە سۆقراتیان وت:

- ئەو قسانەی تۆ دەیانکەی لای خەڵک وەرگیراو و پەسەند کراو نین!!

- سوقرات وتی: لام گرنگ نیە کە خەڵک وەریدەگرێت یان نا، گرنگ ئەوەیە ئەوەی من دەیڵێم ڕاست و حەق بێت.

## • خودا زۆر لەوە دادپەروەرترە

مەنصور بە کۆمەڵێک لە پیاوانی ئەهلی شامی وت:

- ئایا شوکرانەی خودا ناکەن لەسەر ئەوەی کە لەوەتەی ئێمە بووینە دەسەڵاتداری ئێوە تاعونی لەسەر لابردوون!!

یەکێک لە ئامادەبوان بەدەنگ هات و وتی:

خودای گەورە زۆر لەوە دادپەروەرترە کە دوو تاعونمان لەیەک کاتدا بۆ بنێرێت!! مەنصور هیچی نەوت و نوقەی لێبڕا...

## • تۆ هەژاری!!

بە پیاوێکی دانایان وت:

- بەڕاستی تۆ هەژاری!!

- وەلامی دانەوە و وتی:

- جا چۆن پیاو خۆی بەهەژار دەزانێت لە کاتێکدا ئەوەی بووە و هەیە و دەبێ هی ئەو خودایەیە کە ئەو دەیپەرستێ؟؟!!

## • خۆت فەتوات بۆخۆت دا

ڕۆژێکیان کەسێک لە عبدالله ی کوڕی عەباس (خودای لێ ڕای بێت) دەپرسێت:

- تۆ چی دەڵێیت سەبارەت بە گۆرانی وتن؟ ئایا حەرامە یا خود حەڵاڵ؟

- عبدالله دەڵێت: من بە شتێک ناڵێم حەرام مەگەر لە پەرتووکی خودا دا کە قورئانە باسی حەرامی ئەو شتە نەکرابێت.

- پیاوەکە وتی: ئەی کەواتە حەڵاڵە؟

عبدالله وەڵامی دایەوە و وتی:

- من ناشڵێم حەڵاڵە چونکە لە قورئانی پیرۆز دا نەهاتووە کە گۆرانی وتن حەڵاڵ بێت .

دواتر عبدالله سەیری پیاوەکە دەکات دەبینێ پیاوەکە ئەو وەڵامەی ئەوی زۆر لا سەیرە، بۆیە لێی دەپرسێت:

- ئەگەر هاتوو لە ڕۆژی دواییدا ڕەوا و ناڕەوا بهێنن بە باوەڕی تۆ گۆرانی وتن لەگەڵ کامیان دەبێت ؟ -پیاوەکە وتی: لەگەڵ ناڕەوا.

- ئەوسا عبدالله وتی: کەواتە فەرموو برۆ خۆت فەتوات بۆ خۆت دا.

## • مەوقیفێکی سەیری بانگخوازی گەورە دکتۆر زاکیر!

یەکێک لە مەوقیف، یاخود پرسیارە هەر سەیرەکان بەلایەوە ئەوەبووە کە ڕۆژێک لە کۆڕێکی بەرفراوان کەسێک هەڵدەستێتەوە و لێی دەپرسێ:

- باشە کە جوبرائیل بە پێغەمبەری وت: (بخوێنەوە)، محمدیش وتی: نازانم بخوینمەوە، ئایا جوبرائیل هیچ پەڕاوێکی نیشانی محمد دابوو؟!
پرسیارەکە بیرکردنەوەی دەویست...
بۆیە تاوەکو کەمێک بواری بیرکردنەوە بدات بەخۆی دەڵێت:
- ئەگەر جارێکی تر پرسیارەکەت دووبارە بکەیتەوە....ئەویش دووبارەی دەکاتەوە...
دکتۆر دەڵێ: تا ئەو دووبارەی کردەوە کە بە پشتیوانی خودا وەڵامێکم بۆ ئەو کەسە هاتە مێشک.
دواتر دکتۆر زاکیر بەکەسەکە دەڵێت:
- تۆ دەتوانی یابانی بخوێنیتەوە؟
- کابرا: نەخێر.
- دکتۆر زاکیر بە زەردەخەنەیەکەوە: بۆ دەڵێی نەخێر، خۆ من هیچ دەقێکی یابانیم نیشان نەداوی!
گفتوگۆکە بە موسڵمانبوونی کابرا کۆتایی هات.

- **دەبێ بەرەو زانست بچیت، زانست خۆی بۆ لای تۆ نایەت**

پێشەوا مالیک (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەڵێ:
- جارێکیان هارونە ڕەشید هاتە لام و پێی وتم:
- ئەی باوکی عبدالله پێویستە جار جارە بێیە لای ئێمە، تاوەکو منداڵەکانمان لە تۆوە فێری زانست بن و گوێبیستی کتێبەکەشت (الموطأ) بین.

منیش پێم وت:
- خودای گەورە ڕێزدارت بکات، زانست لە دەستی ئێوەدایە، ئەگەر بتانەوێ ڕێزداری بکەن ئەوا ڕێزدار دەبێت، ئەگەر سوکیشی بکەن ئەوا سوک دەبێت، هەروەها پێویستە منداڵەکانت بەرەو پیری زانست بچن، چونکە زانست بەرەو پیری کەس ناچێت!!
- هارون وتی: زۆر ڕاست دەکەیت...

• چۆن زانی کە سەیری دەکات؟

ڕۆژێکیان کچێک بە باوکەکەی دەڵێت:
- باوکە ئەو کوڕەی دراوسێمان زۆر سەیرم دەکات!!
باوکەکەش بێ ئەوەی بیر لە هیچ شتێک بکاتەوە بە توڕەیی دەچێتە بەردەم ماڵی دراوسێکەیان و لەدەرگا دەدات...باوکی کوڕەکە دێتە دەرەوە و بەخێرهاتنی دەکات.
بەڵام باوکی کچەکە بە توڕەیی دەڵێ:
- بەخێرهاتنی تۆم ناوێ، تەنها کەمێک کوڕەکەت پەروەردە بکە!
- باوکی کوڕەکە: بۆچی بووە براکەم؟
- باوکی کچ: کچەکەم دەڵێ کوڕەکەتان بەردەوام سەیری دەکات!!
باوکی کوڕەکە کە پیاوێکی دانا و ژیر بوو زۆر بەلەسەرخۆییەوە وتی:
- باشە براکەم کچەکەتان چۆن زانی کە کوڕەکەی من زۆر سەیری دەکات؟؟

باوکی کچەکە هیچ قسەیەکی پێنەمایەوە...چونکە زانی کە ئەگەر کچەکەی ئەو سەیری کوڕەکەی ئەوانی نەکردبێت نازانێت سەیری دەکات یا نا... بەشلەژاوی داوای لێبوردنی کرد و ڕۆیشت.

### • وەڵامی خاوەن دەستاڕ

کابرایەک ویستی بچێت ئەو گەنمەی لەو ساڵەدا بەرهەمی هێناوە لە دەستاڕی بدات...

ئەوسا دەستاڕی بچوک و گەورە هەبوو، دەستاڕە گەورەکەیان بە گوێدرێژ دەیانخولاندەوە، جا کاتێک ئەو کابرا دەچێتە لای خاوەن دەستاڕەکە، خاوەنەکەی دەڵێت:

- من کاتی ئەوەم نیە گەنمەکەی تۆ لە دەستاڕ بدەم!

کابراش زۆر توڕە دەبێت و دەنگی بەسەر خاوەن دەستاڕ بەرز دەکاتەوە.

کاتێک خاوەن دەستاڕ ئەو ڕەفتارەی دەبینێ هێندەی تر خۆی لەسەر ئەو کابرایە گران دەکات و دەڵێت:

- مادام بەو شێوازە قسە دەکەیت تازە هەربۆت ناکەم!

کابراش دەڵێ:

- واللە ئەگەر ئەو گەنمەم بۆ لە دەستاڕ نەدەی دوعایەکت لێدەکەم کە خودای گەورە خۆت و کەرەکە و دەستاڕەکەشت لە ناو ببات!

- خاوەن دەستاڕ: بۆ تۆ چی؟ پێغەمبەری؟ یان وەلی؟ یان پیاو چاک؟

- کابرا: من بەندەیەکی ئاساییم، بەڵام هەر نزایەک لە خودا بکەم لێم وەردەگرێت و قبوڵ دەبێت!!

- خاوەن دەستاڕ: واتا هەر دوعایەک بکەیت دڵنیاییت کە قبوڵ دەبێت؟

- کابرا: بەدڵنیاییەوە!

خاوەن دەستاڕ: دە ئەوە من ئەو کارەت بۆ ناکەم، بڕۆ بۆ خۆت دوعایەک بکە تا خودا گەنمەکەت بۆ بکات بە ئارد!

- وەڵامی کەنناسێک بۆ ئەصمەعی

جارێکیان ئەصمەعی بەلای کەنناسێکدا تێپەڕ دەبێت کە پیسایی نێو کۆڵانەکانی پاک دەکردەوە، ئەصمەعیش پێی دەڵێ:

- کاکە ئەوە بۆچی کارێکی تر ناکەیت، ئەو کارەی تۆ دەیکەیت یەکجارماندوکەر و پیسە، ئەوە لە کەسایەتی تۆ دادەبەزێنێت!

- کەنناس: من دەمەوێ بەشکۆوە بژیم، بۆیە ئەو کارە دەکەم و لەبەرامبەریشدا بڕێک پارە وەردەگرم!

- ئەصمەعی: جا پاککردنەوەی پیسایی کەسەکانیش شکۆی تێدایە!! ئایا پێت وایە لەو کارە سوکتر و پیستر هەبێت؟

- کەنناس: ئەگەر ئەو کارە نەکەم و پیسایی هاوشێوەکانی وەک تۆ پاک نەکەمەوە، ئەوسا ناچار دەبم بچم دەست لەبەر خاوەن پیساییەکان پان بکەمەوە، دەست پانکردنەوەش لە کەسانی وەک ئێوە بە بڕوای من ئەو پەڕی سوکایەتیە، نەوەک ئەو کارە!

ئەصمەعی نوقەی لیبڕا و ڕۆیشت.

- **نموونەیەک لە ژیرییەکانی ئییاسی کوڕی موعاویەی المزنی**

کاتێک ئییاس وەک دادوەر ڕادەسپێرێت چەندین حاڵەتی سەیر سەیری بە ژیری و زیرەکیەکەی چارەسەر کردن و مافی خاوەن مافی گەڕاندەوە و سەرپێچی کارانی سزا دا...یەکێک لەو نموونانەش:

جارێک کەسێک بڕێک پارە بە ئەمانەت لای هاوڕێکەی دادەنێت...بەڵام دوای ماوەیەک ئەو پیاوە دەچێتە لای هاوڕێکەی و داوای پارەکەی لێدەکاتەوە...بەڵام هاوڕێکەی نکوڵی لەوە دەکات کە هیچ بڕە پارەیەکی لای ئەو دانابێت!

پیاوەکە زۆر شتی بیر دەخاتەوە...بەڵام بێ سوود بوو...تا کار دەگاتە ئەوەی کە دەمەقاڵێ لە نێوانیان دروست دەبێت.

دواتر پیاوەکە دەچێتە لای ئییاس و سکاڵا لە هاوڕێکەی دەکات.

- ئییاس: تۆ دڵنیایی پارەت داوە بەو کەسە؟

- کابرا: بەڵێ بەخودا پێم داوە.

دواتر سکاڵا لێکراو بانگهێشت دەکرێت و ئییاس ڕوو دەکاتە ئەویش و دەڵێ:

- تۆ دڵنیای کە هیچ پارەیەکی ئەو پیاوە بە ئەمانەت لای تۆ دانەنراوە؟

- سکاڵا لێکراو: بەڵێ جەنابی دادوەر، بۆ ئەو مەبەستەش تەنها ئەوە لەسەر منە کە سوێند بخۆم!

بەڵام ئیياس ترسا لەوەی کە سوێند خواردنەکەی ببێتە هۆی کۆتایی پێهاتنی دۆسیەکە، بۆیە نەیهێشت سوێند بخوات...دواتر ڕووی کردەوە سکاڵا کار و وتی:

- لە چ شوێنێک ئەو پارەیەت بەو هاوڕێیەت دا؟

- کابرا: لە فڵانە شوێنە.

- ئیياس: چی لەو شوێنە هەیە؟

- کابرا: دارێکی لێیە، هەر لە ژێر سێبەری ئەو دارەش بەیەکەوە نانمان خوارد و دواتریش پارەکەم پێدا.

- ئیياس: هەستە بڕۆ بۆ ئەو شوێنە و لە ژێر دارەکە بگەڕێ...بزانە هیچ نادۆزیتەوە!!

کابرا ڕۆیشت.

ئیياس بە سکاڵا لێکراوی وت:

- تۆ لێرە دابنیشە تا هاوڕێکەت دەگەڕێتەوە...

دواتر دەستی کرد بە چارەسەرکردنی کێشەی دوپیاوی تر کە لەوێ دانیشتبوون...بەڵام بە تیلە چاوێکیش هەر سەیری سکاڵا لێکراوەکەی پێشووی دەکرد.

کاتێک زانی کەمێک ئارام بۆتەوە و مێشکی لەسەر بابەتەکە نەماوە لەناکاو ڕووی تێکردەوە و وتی:

- پێت وایە هاوڕێکەت گەیشتۆتە ئەو شوێنەی کە پارەکەی تیا پێدایت!

- کابرا: زۆر بە ئاسوودەیی وتی:

- نا نەخێر وا زوو ناگات!
- ئیياس: چۆن دەزانی؟
ئینجا کابرا زانی کە لە زیرەکی ئیياس قوتار نەبوو و درۆکەی ئاشکرا بوو!
ئەوسا ئیياس خۆی لێتورەکرد و وتی:
خیانەت دەکەی و دەتەوێ سوێندیشی لەسەر بخۆی...دوای ئەوەی کابرا گەڕایەوە ئیياس پلانەکەی خۆی بۆ باسکرد و کابراشی زیندانی کرد و داواشی لێکرد کە دەبێ بەزووترین کات پارەکەی بۆ بگێڕێتەوە...

**نموونەیەکی تر بەڵام بە پێچەوانەوە:**

ئیياس سەرەڕای ئەو ئەزموون و ژیریی و وەڵامە بەهێزەکانی کە هەیبوو جارێکیان لەبەرامبەر پیاوێکدا بێ دەنگ دەبێت و قسەی پێ نامێنێ.

**هەر خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێ:**

**- جارێکیان لە ماوەی دادوەریم لە بەسرە پیاوێک هاتە لام و پێی وتم:**

**- فڵانە باغە هی فڵانە کەسە و سنوورەکەشی بۆ دیاری کردم.**

**منیش ویستم لەسەر ئەو شاهیدیەی تاقی بکەمەوە وتم:**

**- باشە کەواتە ژمارەی دار و درەختەکانی ئەو باغە چەندن؟**

**کەمێک وەستا و سەری دانواند...دواتر لە ناکاو سەری بەرز کردەوە و وتی:**

- جەنابی دادوەر تۆ چەند ساڵە دادوەری ئەو ناوچەیە دەکەیت؟
- منیش وتم: هێندە ساڵەیە.
- وتی: دەتوانی پێم بڵێی کە ژمارەی ئەو دارانەی کە خراونەتە سەر سەقفی ژووری دادوەرییەکەت چەندن؟
منیش نەمزانی...بۆیە وتم:
- حەق لای تۆیە...دواتریش شاهیدیەکەم قبوڵ کرد.

- **دۆسیەی فرۆشتنی کانیەکە**

بازرگانێک کانیەکەی خۆی بە جوتیارێکی ناوچەکە دەفرۆشێت. بەڵام کاتێک جوتیارەکە دێت تاوەکو ئاو بۆ باغ و سەوزاییەکەی رابکێشێت، بازرگانەکە دێتە سەر ڕێگای و پێی دەڵێ:
من تەنها بیرەکەم پێ فرۆشتووی نەک ئاوەکە، ئەگەر ئاوەکەشت دەوێ ئەوا پێویستە پارەی ئاوەکەش بدەیت!! بەڵام جوتیارەکە ئەوە ڕەت دەکاتەوە و ڕاستەوخۆ دەچێتە لای دادوەر و سکاڵای خۆی لا باس دەکات...
دواتر دادوەر هەر دوو لایەنەکە بانگهێشت دەکات ...کاتێک زانی کە بازرگانەکە بە دوای فێڵێکەوەیە...دادوەر ڕووی کردە بازرگانەکە و وتی:
- مادام تۆ تەنها بیرەکەت بەو جوتیارە فرۆشتووە لەسەرت پێویستە کە ئاوەکە بەتاڵ بکەیت و لە بیری کابرای ببەیتە دەرەوە!! یان دەبێ لە جیاتی ئەوە بڕێک پارە بدەیت بە جوتیارەکە!!

کاتێک بازرگانەکە گوێی لەوەبوو دەمکوت بوو و سەری شۆڕ کرد و بەشەرمەزاری لە هۆڵی دادوەری چووە دەرەوە!

## • باقلانی و پادشای نەصرانی

باقلانی بەوە بەناوبانگ بووە کە زۆر جار لەگەڵ سەرانی نەصرانی گفتوگۆی کردووە و بەسەریاندا زاڵ بووە...جارێکیان یەکێک لە پادشا نەصرانیەکان دەیەوێ باقلانی ئیحراج بکات و لێی دەپرسێ:

- ئایا هاوسەری پێغەمبەرەکەتان چی بەسەرهاتبوو؟؟ (مەبەستی ڕووداوی بوهتانەکە بوو).

باقلانیش لە مەبەستەکەی تێگەیشت و هەر زوو وتی:

- ئەوەی بەسەرهات کە بەسەر مەریەمی کچی عیمڕان داهات!! بەڵام عائیشە منداڵی نەبوو و مەریەم منداڵێکی پەیدابوو...پادشاکە سور هەڵگدەگەڕێ و دەحەپەسێت و نوقەی نامێنێ.

ئەمە لە کاتێکدایە کە باقلانی باوەڕی تەواوی بەوە هەیە کە هەردووکیان لە قورئانی پیرۆز لەلایەن پەروەردگارەوە پاکیەتیان باسکراوە...ئەوەی وتویەتی تەنها بۆ دەمکوتکردنی پادشاکە بوو نەوەک شتێکی تر.

## • ئایا لە قەدەری خودا ڕا دەکەیت؟؟

کاتێک نەخۆشی تاعون بڵاوبۆیەوە پێشەوای باوەڕداران عومەری کوڕی خەتاب (خودا لێی ڕازی بێت) ویستی بۆ خۆپاراستن و پاراستنی موسڵمانان ڕوو بکاتە شام...

کاتێک ئەبو عوبەیدە ئەمەی زانی بە پێشەوای باوەڕدانی وت:
- ئەی پێشەوای باوەڕداران ئایا لە قەدەری خودا ڕا دەکەیت؟؟
پێشەوا عومەریش وەڵامێکی زۆر جوانی دایەوە و وتی:
لە قەدەری خودا ڕادەکەم بەرەو قەدەری خودا!!

## • کامەیان شەعبیە؟؟

پیاوێک پرسیاری ماڵی فەقیهو و زانای گەورە "شەعبی" لە خەڵکی دەکات و ئەوانیش نیشانی دەدەن... کاتێک دەچێتە ماڵی شەعبی بێ لە دەرگادان دەچێتە ژوورەوە، لەو کاتەدا شەعبی لەگەڵ ژنەکەی دانیشتووە...پیاوەکەش بێ سەلام یەکسەر دەڵێ:
- کامەتان شەعبین؟
- پێشەوا شەعبییش ئاماژە بۆ لای ژنەکەی دەکات و دەڵێ (ئەمە!!).
بەخودا تۆ لەگەڵ خۆتی دەبەی!
پیاوێک بە ئەبوبەکری سدیقی وت:
- والله زیاتر تورەم بکەیت جنێوێکت پێدەدەم کە لەگەڵ خۆت بیبەیتە ژێر گۆڕیش (واتا هێندە لەسەر دڵت بمێنێتەوە).
پێشەوا ئەبوبەکریش زۆر بە لەسەرخۆیی وتی:
- بەخوا تۆ لەگەڵ خۆتی دەبەیتە گۆڕ نەوەک من!!

## • هی خودایە

لە دەشتەکیەکیان وت:
- ئەم وشترە هی کێیە؟
- وتی: هی خودایە، بەس لای منە!!

## • نەبینینی تۆ

ڕۆژێکیان موتەوەکیل بە باوکی عەینای وت:

- ئەی باوکی عەینا ئەگەر تۆ بینایی چاوەکانت لە دەست بدەیت ناخۆشترین و گەورەترین موسیبەت کە بەهۆیەوە تووشی بیت چ شتێک دەبێ بۆتۆ؟؟

- باوکی عەینا وتی: نەبینینی تۆ؟

## • پەنجەکەت باشترە!!

ڕۆژێکیان موعتەسەم بە فەتحی کوڕی خاکان (ئەوسا بچوک بوو) دەڵێت:

- ئایا لەو ئەنگوستیلەی پەنجەی منت باشتر بینیوە؟

- فەتح: بەڵێ ئەی پێشەوای باوەڕداران، ئەو پەنجەیەی کە ئەنگوستیلەکەی تێدایە باشترە!

## • جا بۆ عاقڵەکان نەژمێرم؟؟

بە بالولیان وت:

- دەتوانی شێتەکانمان بۆ بژمێری؟؟

- بالولیش وتی: ئەوە زۆر دەخایەنێت، ڕاوەستن با عاقڵەکان بژمێرم ئەوە ئاسانترە!!

## • گەنجێک و کابرای کوێر

گەنجێک بە کۆڵانێکدا تێپەڕدەبێت، دەبینێ پیاوێکی کوێر بەرەو ڕووی دێت و فانۆسێکی لە دەستدایە، گەنجەکە بە گاڵتەوە بە کابرا دەڵێ:

- ئەی پیاوی کوێر ئەو فانوسەت بۆ بەدەست گرتووە خۆ تۆ یەک شتیش نابینی؟؟!!

پیاوە کوێرەکەش وتی:

- ئەو فانۆسەم بۆخۆم نیە، لەبەر گەنجانی وەک تۆی ئاگا لەخۆبڕاوە، نەوەک لە تاریکیدا خۆم پێدابدەن!

- **ئەوەی وەریدەگرم لەبەرامبەر گوتنە باشەکانمە!!**

ئیبڕاهیمی کوڕی تەمان لە بەیتولمالدا مانگانە لەبەرامبەر فەتواکانیدا بڕێک پارەی بۆ بڕابویەوە، ڕۆژێکیان لە مەجلیسی خەلیفەدا پرسیاری بابەتێکیان لێکرد و ئەویش وتی:

- وەڵامی ئەو پرسیارە نازانم!!

ئامادەبوانی کۆڕەکەش بە توڕەییەوە وتیان:

- مانگانە پارە وەردەگری و کەچی بابەتێکت پێ چارەسەر ناکرێت؟!!

- وتی: من پارە تەنها لەبەرامبەر گوتنە باش و فەتوا دروستەکانم وەردەگرم، خۆ ئەگەر لەبەرامبەر چاک و خراپ پارە وەربگرم، ئەوا دەبێ هەرچی پارەی بەیتولماڵە بیدەن بەمن!!

- **من بەڕەحمتر نیم!!**

پیاوێکیان هێنا بۆ لای مەئمون کە سزای حەددی لەسەر پێویست واجب بووبوو، ئەویش فەرمانی کرد کە حەددەکەی لەسەر جێبەجێ بکرێت...

دوای کەمێک لە لێدان کابرا هاواری لێ بەرز بویەوە و وتی:

- ئەی خەلیفە بەسە منت کوشت!!
مەئمون وتی:
- بەڵکو ئەوە حەقە دەتکوژێ.
- پیاوەکە: کەواتە ڕەحمم پێبکە.
- مەئمون: من لەو کەسە بە ڕەحمترنیم کە ئەو حەددەی لەسەر واجب کردووی!!

## • ژەهر دەخۆین

لە ئاواییێک کابرایەکی بێزارکەر و موزعیج هەبوو، تەواوی ئاوایی لێی بێزاربووبوون، ڕۆژێکیان بەلای هەندێک لە دانیشتوانی ئاواییەکە تێپەڕ دەبێت، دەبینی خەریکی خواردنی شووتین، ئەویش لێیان دەچێتە پێشەوە و دەڵێ:
- ها ئەوە چی دەخۆن؟؟
ئەوانیش بۆ ئەوەی نەیەتە لایان و لەگەڵیان نەخوات دەڵێن:
- ئەوە ژەهرە دەیخۆین!!
ئەویش بە پێکەنینەوە دەچێتە نێوەندی مەجلیس و دەست دەکات بە شووتی خواردن و دواتریش دەڵێ:
- جا من بۆ بژیم لە دوای ئێوە!! (واتە با منیش بەو ژەهرە بمرم).

## • زۆر لای نەخۆش دامەنیشە

کابرایەکی ڕەزا قورس و بێزارکەر دەچێتە لای زانایەک کە ماوەیەک بوو نەخۆش کەوتبوو...
دوای ماوەیەک دانیشتن کابرا بە زاناکەی وت:

- ئەی خاوەن زانست و مەعریفەت تکایە ئامۆژگاریم بکە.
زاناکەش کە زۆر لێی بێزار بووبوو خێرا وەڵامی دایەوە و وتی:
- ئەگەر سەردانی نەخۆشت کرد با سەردانەکەت کورت بێت و زۆر دامەنیشە!!

## • ئەی دایکیان کێیە؟؟

کاتێک ئەبوبەکری سدیق موسڵمانبوو، قورەیش ترسیان لێنیشت،ویستیان هەوڵی لەگەڵ بدەن و پاشگەزی بکەنەوە، بۆ ئەو مەبەستە کەسێکیان دەست نیشانکرد وکردیانە وتەبێژی خۆیان (وتراوە ئەو کەسە تەڵحەی کوڕی عەبدوڵا بووە) دواتریش چوون بۆ لای ئەبوبەکر..

کاتێک گەیشتنە لای تەڵحە چووە پێشەوە، ئەبو بەکر لێی پرسی:
- ها تەڵحە داوای چیم لێدەکەن؟
- تەڵحە: دەمانەوێ بگەڕێیتەوە بۆ پەرستنی لات و عوزا!!
- ئەبوبەکر: لات و عوزا کێنە؟
- تەڵحە: ئەوانە کچانی خودان (پەنا بەخوا).
- ئەبوبەکر: ئەی دایکیان کێیە و ناوی چییە؟
تەڵحە: بێ دەنگ بوو و دواتر ڕووی کردە ئەوانەی کە لەگەڵیدا هاتبوون و وتی:
- فەرموون ئێوە وەڵامی ئەو پرسیارەی بدەنەوە!!
- ئەوانیش بێ دەنگ بوون...
دواتر تەڵحە وتی:

- ئەی ئەبوبەکر منیش دەمەوێ موسڵمان بم، پاشانیش وتی: (أشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاَّ الله، وَأنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله).

• وەڵامێکی دەمکوتکەری سەفیری عوسمانی

یەکێک لە سەفیرەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ گەورە بەرپرسانی وڵاتی بەریتانیا کۆدەبێتەوە.

یەکێک لە بەرپرسە بەریتانیەکان زۆر بە لوت بەرزی و خۆبەگەورەزانینەوە ڕووی کردە سەفیرە عوسمانیەکە و وتی:

- باشە ئێوە بۆ سوورن لەسەر ئەوەی کە دەبێ ئافرەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە دواکەوتوویی و بە داپۆشراوی دوور لە پیاوانی بێگانە بمێننەوە؟

سەفیرەکەش بێ ئەوەی هیچ خۆی بشێوێنێ وەڵامی دایەوە وتی:

- چونکە ئافرەتانی ئێمە نایانەوێ جگە لە هاوسەرەکانی خۆیان لەکەسی تر منداڵ بنێنەوە!!

کاتێک ئەمەی وت بەرپرسەکە سڕ بوو و هیچی تری نەوت ...

• دکتۆر و شێتێک!!

دکتۆرێک دەیەوێ ئاستی شێتێک تاقیبکاتەوە، تاوەکو بزانێت ئاخۆ هیچ گۆڕاوە یاخود نا...

- دکتۆر : دەتوانی پێم بڵێیت ئەمڕۆ چەند شەممەیە ؟

- شێت : ئەمڕۆ شەممەیە .

- دکتۆر : ئەی سبەی ؟

- دکتۆر : واتە ئەمرۆ شەممەیە و سبەش هەر شەممەیە ! ئەی کەی یەک شەم دێت؟

- شێت : یەک شەم دێت کاتێک هەست دەکەین ئەمرۆ جیاوازە لە دوێنێ، کاتێ هەست دەکەین دنیا هەنگاوێک بەرەو پێشی بردووین، کاتێ عەدالەتی ئەمرۆ زیاتر بێت لە هی دوێنێ، کاتێک زوڵمی ئەمرۆ کەمتر بێت لە هی دوێنێ، کاتێک ئێمە هەست دەکەین هەنگاوێک پێشکەوتوین و دوو ساڵ بەرزکراوینەتەوە.. ئەو کات یەک شەممە دێت .

دکتۆرەکە سەری لە وەڵامەکەی سوڕما و وتی:

- بە ڕاستی ئەگەر تۆ عاقڵ نەبی، ئەوا کەسمان عاقڵ نین!!

- **بۆم بنووسە!!**

کوڕێک لە لوبنان سواری پاس ئەبێ...

پاش کەمێک کچێکی زۆر جوان دێت و لە تەنیشتی دائەنیشێت.

دوای کەمێک پاسەکە ئەڕوات، کچەکە بە چرپە بە کوڕەکە دەڵێت:

- بەبێ هەرا چی پارەت پێیە پێمبدە و بەبێدەنگیش مۆبایلەکەت بدەرە دەستم، ئەگەرنا ئابروت دەبەمو هاوار دەکەم، دەڵێم:

- ئەو کوڕە دەست درێژی کردۆتە سەرم، دواتریش دەتبەنە لای پۆلیس و ئەوکاتیش خۆت دەزانی چیت بەسەر دێت.

کوڕەکەش وەرەقەو قەڵەمێک دەر دەهێنێت و بە عەرەبی لەسەری دەنوسێ:

- من کەڕو لاڵم و هیچ نابیستم و ناتوانم قسە بکەم... چیت ئەوێ بۆم بنوسە.

کچەکەش بە جوانی هەموو ئەو قسانەی بۆ دەنوسێت کە پێشتر کردنی.

- کوڕەکەش بۆی دەنوسێت ئێستا تا هێزت هەیە دەتوانی هاوار بکەیت، چیت دەوێ بیڵێ، چونکە ئەوەتا بە دەست و خەتی خۆت هەمویت بۆ نوسیوم و منیش دەیدەمە دەستی پۆلیس.

کچەکە زانی فێڵەکەی شکستی هێنا بێ دەنگ بوو و تا داشبەزی سەیری کوڕەکەی نەکردەوە!!

## • گفتوگۆی نێوان دوو هاوڕێ

دوو هاوڕێ بەیەک دەگەن و ئەم گفتوگۆیە لە نێوانیاندا ڕوودەدات: سەرەتا یەکێک لە هاوڕێکان کە ڕووخسارێکی جوانی هەبوو، زۆر بە جوانیەکەی خۆی دەنازی، بە نازێکەوە بە هاوڕێکەی دەڵێ:

- تۆزۆر ناشرینی ..!

ئەوە کە جوانی دابەشکرا تۆ لە کوێ بووی؟

کابراش هیچ خۆی تێک نادات و بە هێمنی دەڵێت:

- ئەو ڕۆژەی کە جوانی دابە شکرا

لە هەمان کات و رۆژدا

ئەخلاق دابەشکرا..من چوم بۆ ئەوێ

ئەخلاق وە رگرم تۆ چوی جوانی وەرگری

ئێتر تا من ئەخلاقم وەرگرت جوانی نەمابوو.

تا تۆش جوانیت وەرگرت ئەخلاق نەمابوو.

کابرای ڕوخسار جوان زانی کە قسەیەکی هەڵەی کردووە و ئەوەی هەیە بەخششی خودایە، بۆیە داوای لێبوردنی لە کابرای بەرامبەر کردوو و پەشیمان بوویەوە لەوەی کەوتی.

**• وەڵامی بالول دەربارەی حەرام بوونی شەڕاب**

دەگێڕنەوە ڕۆژێ بالول دەچێت بۆلای هارون لەوکاتەدا هارون خەریکی نۆشینی شەڕاب بووە، بۆئەوەی حەرامی کارەکەی بشارێتەوە لە بالول دەپرسێ:

- ئایا خواردنی ترێ حەرامە؟

- بالول: نەخێر.

هارون: ئەی خواردنی ئاوی ترێ؟

- بالول: نەخێر.

- هارون: ئەی ئەگەر هەرکامیان چەند ڕۆژێ لەبەر خۆر بمێنێتەوە حەرامە؟

- بالول دیسان دەڵێ: نەخێر.

- هارون: ئەی بۆچی کاتێ ئەو ئاو و ترێیە ماوەیەک لەبەر هەتاو بمێنێتەوە حەرام دەبێ؟

بالول وەڵامێکی ژیرانەی دەداتەوە و دەڵێ:

- ئەگەر هەندێ گڵ و خۆڵ بدەن بەسەرت سەرتدا ئازار دەبێ؟

- هارون: نەخێر.

- بالول: ئەی ئەگەر ئاوت پێدابکرێ؟

- هارون: نەخێر.
- بالول: ئەدی ئەگەر ئاو و گڵەکە تێکەڵ بکرێ و خشتێکی لێ دروست بکرێ ماوەیەک لەبەر هەتاو دابنرێ پاشان بیکێشن بەسەری مرۆڤدا؟
- هارون: بەڵێ بە دڵنیابییەوە ئازاری پێ دەگەیەنێ و سەری ئەشکێنێ.
ئەوسا بالول وتی:
- هەروەک چۆن بەتێکەڵ کردنی ئاو و گڵ و دانانی لەبەر خۆر سەری مرۆڤ ئەشکێنێ ، ئاواش تێکەڵ کردنی ئاو و ترێ و دانانی لەبەر هەتاو خراپیەک دێنێتە ئاراوە کە شەرع حەرامی کردوە، چونکە بەخواردنی ئەو پیسیە زیانی زۆر بە مرۆڤ دەگەیەنێ .
هارون لەوەڵامە لۆژیکیەکەی بالول سەری سوڕماو فەرمانی کرد شەڕابەکە برێژن.

## • ئەی پشتم

ڕۆژێکیان کابرایەکی ستەمکار زللەیەکی توند لە بناگوێی گەنجێکی هەتیو و هەژار دەدات، گەنجەکە هاوار دەکات و دەڵێ:
- ئەی پشتم!
ستەمکارەکە زۆر لای سەیر دەبێت بەگەنجەکە دەڵێ:
- من زللەم لە بنا گوێتدا، تۆ بۆ هاواری شتت دەکەی؟؟

- گەنجەکە: ئەگەر پشت و پەنام هەبوایە تۆ نەتدەتوانی ئاوا بەکەیفی خۆت زللە لەمن بدەیت!!

- **بە دەنکەوە پێیان فرۆشتم!!**

ڕۆژێکیان لە بازاری بەسرا بینیان شێتێک بە دەنکەوە خورمای دەخوارد، لێیان پرسی:

- ئەوە بۆچی بەدەنکەوە ئەو خورمایە دەخۆی؟

- وتی: ئاخر کاتێ کڕیم دەنکەکەشیان لەسەر حیساب کردم!!

- **خۆ خۆت گوێبیستی مایەپوچیم بووی؟**

ڕۆژێکیان کۆمەڵە خەڵکێک دەچنە لای والی و سکاڵا لە کەسێک دەکەن و دەڵێن:

- جەنابی والی فڵانە کەس (١٠٠٠) دیرهەمی ئێمە قەرزدارە و نامانداتەوە.

والیش کابرای قەرزداری بانگهێشت کرد و پێی وت:

- ها تۆ چی دەڵێیت، ئایا ئەوانە ڕاست دەکەن؟

- کابرا بەڵێ جەنابی والی، هەرچی ئەوان دەیڵێن ڕاستە، بەڵام با کەمێک لەسەرم بوەستن تا مەڕ ومالات و زەوی و زارەکەم دەفرۆشم ئینجا حەقەکەیان دەدەمەوە!!

- وتیان: جەنابی والی بەخوا ئەو پیاوە ڕاست ناکات، نە تاکە مەڕ و مالاتێکی هەیە بیفرۆشێ نە مەترێ زەوی و زار...

ئینجا کابرای قەرزدار ئەوەی بەدەرفەت زانی و وتی:

- فەرموو جەنابی والی خۆ خۆت گوێبیستی مایەچوچ بونم بووی، ئەی من بەچی بتوانم ئەو قەرزە بدەمەوە؟
خاوەن قەرزەکان بێدەنگ بوون و والیش فەرمانی ئازادکردنی دا.

## • تۆش شەوان هەڵدەستیەوە؟؟

ڕۆژێکیان لە مەجلیسێکدا باسی شەو هەستانەوە بۆ شەونوێژ دەکرا، کابرایەکی دەشتەکیش لەوێ ئامادەبوو، نەیدەزانی باسی چی دەکەن...لەناکاو یەکێک لە ئامادەبوانی مەجلیسەکە ڕووی لە دەشتەکیەکە کرد و وتی:
- ئەی فلان ئایا تۆش شەوان هەڵدەستیەوە؟؟
- کابرای دەشتەکی: بێگومان، ئەی چۆن هەڵناستمەوە!!
- کابرا: جا کە هەڵدەستیەوە چی دەکەیت؟؟
- کابرای دەشتەکی: واللە زۆربەی جار میزێک دەکەم و دەنوومەوە!!

## • من لە یادم نەچووە!!

جارێکیان کابرایەک دەچێتە لای کوڕی الجهم و پێی دەڵێت:
- گەورەم، تۆ ماوەیەک بەر لە ئێستا بەڵێنت پێدام کە بڕێک پارەم پێبدەیت؟
- کوڕی الجهم: بیرم نایەت!!
- کابرا: بەڵام من هەر بیرم ماوە.
- کوڕی الجهم: بۆچی من لە یادم چووە تۆش هەربیرت ماوە؟؟

- کابرا: ئاخر گەورەم، تۆ ڕۆژانە ڕەنگە بەڵێن بەچەندان کەس بدەیت، بەڵام ئەوەی من بەڵێنم لێوەرگرتووە تەنها یەک کەسە و ئەویش تۆی!!

کوڕی الجهم زۆر بە وەڵامەکەی سەرسام بوو، فەرمانی کرد کە پێداویستیەکانی بۆ دابین بکەن.

- **دەترسم لەسەر دەستی تۆ هیدایەت بدرێم!!**

کاتێک ئەبو نەواس نەخۆشکەوت کابرایەکی ڕیاکار و فیڵباز هاتە لای و پێی وت:

- ئەی ئەبو نەواس لە خوا بترسە!! چونکە بەڕاستی خودا لێ خۆشبوو و میهرەبانە، لە زۆرێک لە خراپەکارەکان خۆشبووە کاتێ تەوبەیان کردووە و داوای لێخۆشبوونیان لێ کردووە...دەی تۆش داوای لێخۆشبوون بکە و تەوبە بکە...

- ئەبو نەواس: تۆ ڕاست دەکەیت بەڵام وا ناکەم!

- کابرا: بۆ؟

- ئەبو نەواس: لەوە دەترسم لەسەر دەستی کەسێکی وەک تۆی ڕیاکار و فێڵباز هیدایەتی وەربگرم و تەوبە بکەم!!

- **من پێغەمبەرم!!**

لەسەردەمی مەئمون کەسێک بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد و دەیووت من پێغەمبەرم!!

ڕۆژێکیان مەئمون بانگهێشتی دەکات و پێی دەڵێ:

- بەلگەی پیغەمبەرایەتی تۆ چیە؟
- کابرا: بەڵگەی من ئەوەیە کە هەرچی لەناخی تۆدایە دەیزانم!!
- مەئمون: دەی بابزانم چی لەناخی من دایە؟؟
- کابرا: من دەزانم تۆ گاڵتەت بەمن دێ و منت پێ درۆزنە!!
مەئمون لە قاقای پێکەنینیدا و وازی لێهێنا

## • دەبوو ئێستا سەرت وەک ئێستر بوایە!!

ڕۆژێکیان دەشتەکیەک دەچێتە میوانخانەی سلێمانی کوڕی عبدالملک، ئەویش بەکابرای دەشتەکی دەڵێ:
- فەرموو وەرە فالوزەج بخۆ (جۆرێکە لە شیرینی) زۆر باشە بۆ دەماغ!!
کابرای دەشتەکیش هەستی کرد کە سلێمان گاڵتەی پێدەکات، بۆیە وتی:
- جا ئەگەر ئەوە ڕاست بێت، دەبوو ئێستا سەری جەنابتان هێندەی سەری ئێستریک بوایە!!
سلێمان دەمکوت بوو و چیتری نەووت.

## • ئەصمەعی و دزێک

ئەسمەعی ئافرەتێکی بینی سەبەتەیەک هەناری بەسەرەوەبوو، لەو لاوە کابرایەک هات هەنارێکی لێ دزی، پاشان ئەسمەعی دوای کەوت، بەڵام بینی وا کابرا هەنارەکەی دەبەخشێ بە هەژارێک!!
ئەسمەعی لە کابرا چووە پێش و وتی:

- سەیرە کاتێک دزیت وامزانی حەزت لێیەتی!! بەڵام بینیم کە بەخشیت بە هەژارێک!! بۆچی ئەم کارە کرد؟

- کابرا وتی: نا من دزیم نەکردووە من بازرگانی لەگەڵ خودای گەورە دەکەم !!

ئەسمەعی وتی چۆن؟

- کابرا وتی: کاتێک دزیم یەک گوناهم لەسەر نوسرا، بەڵام کە بەخشیم ١٠ خێرم بۆ نوسرا، لە کۆتایدا ٩ خێرم بۆ مایەوە!! ئێستا دەبینی کە چۆن بازرگانی لەگەڵ خودادا دەکەم؟

- ئەسمەعی وتی:

- بەڵام لە ڕاستی کاتێک دزیت گوناهێکت بۆ نوسرا، کە بەخشیشت خودا قبولی ناکات، چونکە خودا پاکەو پاک نەبێت وەری ناگرێ! تۆ وەک ئەو کەسەی کە پۆشاکی پیس بە میز دەشوات!

کابرا سەری داخست و ڕۆژیشت.

- **پیاوەتیت لێکەوت!!**

گەنجێک لە شەقامێکدا پایسکلی لێدەخوڕی ...

لە ناکاو خۆی بە ئافرەتێکدادا

ئافرەتەکە کەوتە سەر زەوی.

کوڕەکە بۆلای ئافرەتەکە نەگەڕایەوە و داوای لێبوردنی لێنەکرد..

سەرەڕای ئەوەش بە ئافرەتەکە پێدەکەنی و دواتریش دەستی کردەوە بە لێخوڕینی پایسکلەکەی!!

پیاوێکی خاوەن ئەزموون کە هەر لەسەرەتاوە ئاگاداری ئەو دیمەنانە بوو بانگی گەنجەکەی کرد و وتی:
_ هۆی گەنج بگەڕێوە، شتێکت لێ کەوتووە!
کوڕەکە بە خێرایی گەڕایەوەو لە پایسکلەکە دابەزی و دەستی کرد بە گەڕان لە جێگای ڕووداوەکە،بەڵام هیچی نەدۆزیەوە.
دواتر ڕووی کردە پیاوەکە و وتی:
- کوا چیم لێکەوتووە؟
پیاوەکە وتی:
- ئەوەی لێتکەوتووە پیاوەتیە، تازە بۆی مەگەڕێ، ون بوو!!

- **تۆ ناوەکەی بگۆڕە منیش جل و بەرگم دەگۆڕم**

گەنجێک عێراقی بەسەردان دەچێتە وڵاتی سوریا، لەوێ بەمەبەستی چەند کاتێکی خۆش و ئارام و بەسوود سەردانی یەکێک لە سەنتەرەکانی ئەو وڵاتە دەکات کە ناوی (المركز الثقافي العربي)بوو بە مەبەستی بەسەربردنی کاتێکی خۆش و خوێندنەوەی چەند شتێکی بەسوود.
گەنجەکە بەجل وبەرگی عەرەبی (دشداشە) دەچێتە ئەو سەنتەرە و لەسەر مێزێک دادەنیشێ.
دوای کەمێک بەڕێوەبەری سەنتەرەکە دێت و بەگەنجەکە دەڵێت:
- هەرکەسێک بێتە ئەو سەنتەرەوە پێویستە جل و بەرگی غەربی واتا بانتۆڵ و کراس ببۆشێ، پۆشینی ئەو جل وبەرگەی جەنابت لێرە نەگونجاو و ڕێپێدراو نیە!!

گەنجەکەش زۆر بەهێمنی وەڵامی بەڕێوەبەری دایەوە و وتی:
- بەڕێزم هەر کاتێک تۆ تەنها یەک نوقتە لە ناوی سەنتەرەکەت زیادبکەیت واتا لە (المركز الثقافي العربي) یەوە بیکەیت بە (المركز الثقافي الغربي) ئەوا من تەواوی جل وبەرگەکانم دەگۆڕم!!
بەڕێوەبەر سەری شۆڕکرد و سڕ و مات بوو.

- **مرۆڤ لەسەر جوانترین شێوە دروستکراوە!!**

عیسای کوڕی موسا ژنەکەی خۆی زۆر خۆشدەویست.
ڕۆژێک لەزۆر خۆشەویستی و زۆر سەرسامی بەجوانیەکەی لەدەمی دەردەچێت و دەڵێت:
- تەلاقم کەوتبێ ئەگەر تۆ لەمانگ جوانتر نەبیت!!!
ژنەکەی زۆر بەو قسەی عیسا خەمبار دەبێت و بەدڵ شکاوییەوە وتی:
- تەواو تەلاقەکەت کەوت، بۆیە هەستا وماڵەکەی جێهێشت و ڕۆیشت...
ئەو شەوە سلێمان نەیدەزانی چی بکات، خەریک بوو لە خەمان دڵی پارچە پارچە دەبوو، هەر کە ڕۆژبویەوە، زوو چوو بۆلای خەلیفە منصور و پێی وت:
- گەورەم چارەم بکە، حاڵم زۆر پەرێشانە و مردنم زۆر لەو ژیانە لا خۆشترە!!
دواتر حاڵ و مەسەلەکەی بۆ خەلیفە گێڕایەوە...

خەلیفەش ئەو بابەتەی زۆر بە گرنگ وەرگرت، هەر بۆیە بانگهێشتی هەموو زانا و شەرعزانانی کرد و پێی وتن:

- چارەسەرێک بۆ ئەو بابەتە بدۆزنەوە.

هەموو زاناکان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە عیسا تەڵاقەکەی کەووتوە، جگە لە یەکێکیان کە هیچ قسەیەکی نەکرد...

خەلیفەش ڕووی تێکرد و وتی:

- جەنابتان چیتانە؟؟ بۆ قسەیەک لەسەر ئەو بابەتە ناکەیت؟

دواتر ئەو زانایە بە زەردەخەنەیەکەوە وتی:

- جەنابی خەلیفە ئەو تەڵاقەکەی نەکەوتووە، بە بەڵگەی قورئانی پیرۆزبسم الله الرحمن الرحیم ﴿ وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ ۝١ وَطُورِ سِينِينَ ۝٢ وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ۝٣ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴾ [التين: ١ - ٤].

بەگوێرەی ئایەتی چوارەمیش مرۆڤ لەسەر جوانترین شێوە دروست کراوە، هەر بۆیە تەڵاقەکەی نەکەوتووە...هەموویان لە دانایی ئەو زانایە سەریان سوڕما و عیساش گەشایەوە، دواتر خەلیفە بە عیسای وت:

- ئەوە خوا دەرگای ڕەحمەتی لێکردیتەوە، دەبڕۆ لەگەڵ هاوسەرەکەت بەخۆشی بژین.

# سەرچاوەکان

دوای قورئانی پیرۆز...

تەفسیری ئاسان (بۆ تێگەیشتنی قورئان)، بورهان محمدأمین.

- الأجوبة المسكتة للاستاذ إبراهيم بن عبد الله الحازمى، الشريف للنشر والتوزيع.

- الأجوبة المسكتة: إبراهيم بن أبى عون، تح: مى أحمد يوسف، ط: عين للدراسات والبحوث الإنسانية والاجتماعية، القاهره، ط١٩٩٦ ،١ م.

- المستطرف فى كل فن مستطرف، شهاب الدين محمد بن أحمد بن منصور الآبشيهى أبو الفتح (المتوفى: ٨٥٢هـ)، عالم الكتب - بيروت، ط ١، ١٤١٩ هـ.

- قصص العرب، موسوعه تراثية جامعة لقصص ونوادر وطرائف العرب فى العصور الجاهلى و الإسلامى، إبراهيم شمس الدين، دار الكتب العلمية بيروت- لبنان، ٢٠٠٢.

- مجلة جامعة دمشق، المجلد ٣٠، العدد ٣+٤، ٢٠١٤.

- متعة الحديث، جمع وإعداد، عبدالله بن محمد بن راشد الداوود، مكتبة الملك فهد الوطنيه، الرياض، ٢٠١٨.

- أخبار الاذكياء، جمال الدين أبى الفرج عبدالرحمن بن على بن الجوزى القرشى البغدادى، دار ابن حزم، بيروت- لبنان، ٢٠٠٣.

- الأجوبة و الاسئلة المسكتة وماجرى مجراها من اللطائف والمكاتابات، د. حسين حسن طلافحة، الاردن. د. ت. ط.

- البداية والنهاية، أبو الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير القرشى الدمشقى المحقق: على شيرى، دار إحياو التراث العربى الطبعه: الاولى ١٤٠٨، هـ - ١٩٨٨ م.

- حتى لا تقع فريسة لزلة لسانك، ماتياس بوم، نقله الى العربية : د . إلياس حاجوج، مكتبه العبيكان.

- سرعه البديهة ... سلاح الاذكياء، أحمد محمد عطيات، دار أمواج للنشر، عمان، ٢٠١٢.

- الرد الجميل، د. عبير عبدالله النعيم، دار العبيكان للنشر.

- پێگەی یوتوب، محاضرات د.زاكير نايك.

چاوەروانی

بەرگی دووەم بن بە PDF

ئامادەکردن و کردنە PDF

رۆژگار کەرکوکی

بیڵ گیتس ملیاردێری بەناوبانگ
چووە کافیتریایەکەوە و
قاوەیەکی خواردەوە و 1
دۆلاری دابەخاوەن کافیتریاکە ،
ئەویش ووتی
کورەکەت دوێنی 100 دۆلاری دا
بۆ قاوەیەک ،
لە وڵامدا ووتی :
کورەکەم باوکی ملیاردێرە
بەڵام من باوکم جوتیارە



بەرگ : ئیبراهیم صالح

bookstore
ZANYAR